چاپی دووەم

سایە





پۆڵ ستراتێرن

وەرگێڕانی: عەلی ئەکبەر مەجیدی

# ساتێک لەگەڵ سوقرات

2010

**ناسنامەی کتێب:**

ناوی کتێب: ساتێک لەگەڵ سوقـرات

نووسینی: پوڵ ستراتێرن

وەرگێڕانی بۆ فارسی: عەلی جەوادزادە

وەرگێڕانی بۆ کوردی: عەلی ئەکبەر مەجیدی

Shawi_hewr@yahoo.com

تایـپ : ئانیتا

دیزاین: ناوەندی سایە

چاپەمەنی : سایـــــــــــە

چاپی یەکەم : ٢٠٠٩

چاپی دووەم: ٢٠١٠

تیراژ : ٢٠٠٠

نرخ: ٢٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن:﴿١٥٩٦﴾

## پێرست


بابەت ــــــــــــــــــــــــ لاپەڕە

پێشەکی.......... ٧

ژیانو بەرهەمەکانی سوقرات.......... ١٧

کابۆسی سوقرات.......... ٥٢

میراتی سوقرات.......... ٥٦

هەندێ ووتار لەسەر سوقرات.......... ٦٠

ڕۆژمێری ڕووداوە گرنگەکانی فەیلەسوفەکان.......... ٦٧

ڕۆژمێری ژیانی سوقرات.......... ٧١

ڕۆژمێری سەردەمی ژیانی سوقرات.......... ٧٢

## پێشەکی:

سـەرەتای جیهـان هیـچمان لـە سـەر چـۆنیەتیو بـارودۆخی جیهانـەوە نەماندەزانی. سەرەڕای ئەمانەش ئێمەی مـرۆڤ لـەم جیهانـەدا توانیمـان خۆمان بگرینەوە. یەکەم فەیلەسوف ئەو مرۆڤە سەرلێشێواو و سـەیرو سـەمەرەی سـەردەمی چـاخی بـەردین بـوو کـە لـەبارەی جیهانـەوە لـە خۆیی دەپرسی: لە سەر ئـەم زەویـەدا چ باسـەو هـەموو ئـەم شـتانە بـۆ چییە؟

تا چەندین هەزار ساڵ وەڵامەکانمان بۆ ئەم پرسیارە فەلسەفیانە واتـای پڕاوپڕی پڕ نەدەکردەوە بەڵکو کۆمـەڵێك بـوو لـە ئەفسانەو خورافـەو باوەڕی ئاینی. یەکەم میللەت کە هـەوڵی دا وەڵامـی ئـەم جۆر پرسـیارە فەلـسەفیانە بداتـەوە پـەنای بـۆ بـیروڕای بیـنینو عـەقڵ کـرد رەنگـە دەبوایە لە بری ئەوە پەنای بۆ بیروڕای متافیزیایی ببردبا، ئەم میللەتە یۆنانیـەکانی پـێش زایـین بـوون. ئەمـە نهـێنیو رازێکـە کـە بۆچـی نەتەوەیەك لە پاڵ دەریای سپی یەکـەم هـەنگاوی گـەورەیان هـەڵێنا بـۆ کـامڵ بـوونی مـرۆڤ ئـەوەش لـەو سـەردەمەدا، ئەمـە وەك نهێنیـەکی زانـستی ماوەتـەوە. هـەر لـەم سـەردەمەدا چـینیەکانو میـسریەکانو

بابیلیەکان لە یۆنانیەکان پێشکەوتووتر بوونو شارستانیەتیشیان لە بواری هێزو بەربڵاوی لە سەرووی شارستانیەتی یۆنانیەکانەوە بوو هەروا لە داهێنانو بیرکاری دا لە یۆنانیەکان پێشکەوتووتر بوون. دروستکردنی ئاورێشمو دروستکردنی ئەهرامەکانو پێشبینی خۆرگیران لە توانای یۆنانیەکاندا نەبوو. لە پێوانەکردنی ئاڵۆزبوونی بیروباوەڕی چینیەکانو بابیلیەکانو میسریەکان لە بەرامبەر کۆمەڵە ئەفسانە سەرەتاییەکانی یۆنانیەکان لە بارەی ژیانی خواوەندەکان لە کوێستانی ئۆڵەمپ زیاتر دەهاتە پێش چاو. لە راستیدا لەم سەردەمەدا ئەو شتەی یۆنانیەکان بەرامبەر بە ئەفسانەکان هەیانبوو تەنها رەوتێکی سەرەتایی بوو لەبارەی داهێنانی ئاین (وەك چۆن قوربانی کردن یەکێك بوو لە تایبەتمەندییە پێشکەوتووەکانی ئایینە دێرینەکان، کە یۆنانیەکانیش ئەمانەیان هەبوو).

ئەفسانەکان بە لای یۆنانیەکانەوە وەك کلیلی کردنەوەی شتە نهێنیەکانیان وابوو بە بێ ئەوەی فەرهەنگی یۆنانی کە هێشتا بنەمای فەرهەنگی رۆژئاوایی بوو، ئەگەیشتبووە ئاستی پێویست.) پێش یۆنانیەکان پرسیارە فکریەکان بە بەردەوامی شێوازێك بوو لە پابەندی بە ئاینو هەر ئەمەش بووە هۆی تەشەنەکردنی متافیزیاو خورافە لە رەوتی بینینو بیرکردنەوەدا. بۆ نموونە زانستی ئەستێرەناسی بابیلیەکان بە پێشبینی داهاتوو هەروەها بیرکاریی میسرییە دێرینەکان تێکەڵ بە خورافەی ئاینی ببوون، بەڵام کاتێك یۆنانیە دێرینەکان دەستیان بە دارشتنی پرسیاری فکریان کرد بیرکردنەوەیان بە هۆی

باری قورسی خورافە گیرۆدە نەبوون بەڵکو بە ئازادییەوە لە جیهانی راستەقینەدا دارێژرا.

رەنگە لە ئاراستەی ئەم ئازادییەدا بە هۆی دۆخی خورافە بوو کە کلتوری یۆنانی بە خێراییەکی پەرجۆئاسا بەرەو پێشکوتن و بڵاوبوونەوە رۆیشت. بۆ نموونە تەنها لە ماوەی زەمەنی جیلێکدا سەری لە نمایشی سەرەتایی ئاینی و تراژیدیای یۆنانی دێرین جووقی دا. لەمڕووەوە دەسپێکی فەلسەفەی یۆنانی لە سەدەی شەشەمی پێش زایین بوو، بەڵام لە کۆتایی هەر ئەم سەدەیەدا ئەفلاتوونێك دەبینین کە هێشتا بەرجەستەترین روخساری فەلسەفی هەموو

سەردەمەکان دەناسرێت. پێشکەوتنی فەلسەفی یۆنانینەکان لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین لە بواری چۆنیەتییەوە بە درێژایی مێژوو بە بێ رکەبەر ماوەتەوەو تەنها سەدەی بیستەم لەوە پێشکەوت.

زۆرینەی فەیلەسوف ناسەکان یەکەم فەیلەسوفی یۆنانیەکان بە "تالیس" دادەنێن کە خەڵکی "میلتۆس"ەو یەکێکە لە شارەکانی ئاسیای بچوك. مێژوو کاتێك ناوبانگ لە خۆ دەگرێت کە لە ساڵی (٥٨٥)ی پێش زاین کاتێك بە هۆی پێشبینی سەرکەوتوانەی خۆرگرتن لە هەمان ساڵدا بوو. (لەوانەیە ئەم شێواز پێشبینیەی تالیس لە بابیلیەکانەوە فێر بووبێت، ((هەڵبەت ئەمەش ئەگەرەو نەسەلێندراوە کە لەوانەوە فێر بووبێت، چونکە هەندێ کەس شتێك دەدۆزێتەوە بە بێ ئەوەی ئاگادار بێت کە پێشتر شتێکی وا هەبووە ئەوەش لەو

سەردەمەدا کە ئامرازی پەیوەندی لە جیهاندا زۆر دەگمەن بووە)).
تالیس یەکەم فەیلەسۆف بوو هەوڵی دا ئەم جیهانە بە شێوەی بینین هەڵبسەنگێنرێت تا وەك ئەوەی لە سەر ئەفسانەو خورافە بێت بۆیە بەم هۆیەوە بە یەکەم فەیلەسۆف دایدەنێن. ئەم شێوازەی بەو واتایە بوو دەرەنجامەکانی چ راست یان ناڕاست لە سەر رەوتی عەقڵ هەڵسەنگاندن بۆ شتەکان دەکرا (بە پێچەوانەی دەرەنجامەکان کە لە سەر رەوتی ئەفسانەو باوەڕە ئاینیەکان هەبوو). بیرۆکەی ئاراستەی جیهانناسی تالیس وابوو کە هەموو شتێك لە کۆتاییدا لە ئاو دروست بووە. بەم بیرۆکەیە رێگای بۆ هەموو فەلسەفەکانی داهاتوو کردەوە.
پاش تالیس فەلسەفە بە خێرایی بەرەو پشکوتن رۆیشت. فەیلەسۆفێکی زۆر هاتنە ناو گۆڕەپانی فەلسەفە کە هەر یەکەو روانینێکی جیاوازی لەبارەی جیهانەوە هەبوو. یەکێ دەیوت هەموو جیهان نەك لە ئاو بەڵکو لە ئاگر...
دروست بووەو ئەویتر دەیوت هەوا سەرچاوەی هەموو شتەکانەو کەسێکی تر دەهاتە قسەو دەیوت رووناکی سەرچاوەی جیهانە.
فەیلەسوفەکانی سەردەمی سەدەی شەشەم تا ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی پێش زاین بە واتای "فەیلەسوفەکانی پێش سوقرات" لە مێژووی فەلسەفەدا دەناسرێنەوە. ئەو شتەی ئەمڕۆکە لەبارەی ئەم فەیلەسوفانەوە دەیزانین تەنها بابەتێکی پەرش‌و بڵاون کە یان راستەوخۆ لە نووسینەکانی خۆیانەوە یان بە هۆی قسەو نووسینی ئەو

فەیلەسوفانی دوای ئەوان پێی گەیشتووین. سەرەڕای ئەمانەش هێشتا ناوێکی زۆری فەیلەسوفان لە سەر زاری خەڵکە.

فیساغۆرس بە هۆی مەسەلەیەکی بیرکاریەوە ناوبانگی هەیە، یەکەم کەس بوو ئاگاداری رۆڵی ژمارەکان بوو لە مۆسیقادا، مەبەست ئەوەیە هارمۆنی لە مۆسیقادا سەرچاوە لە رێژەی ژمارەکانە. هەر ئەم دۆزینەوەشی بووە بیرۆکەیەکی جیهانناسی کە هەموو جیهانی بە پێکهاتەیەك لە ژمارەکان دادەنا. بیرۆکەیەکی وا بە پێچەوانەی رواڵەتی ئەو شتە بە هیچ شێوەیەك سادە نەبوو. هەروا ئەنیشتاین بڕوای وابوو دەتوانرێت هەموو جیهان کە هەیە بە بیرکاری شرۆڤە بکرێت. بیرمەندان‌و زانایانی ئەمڕۆ جیهان بە پێکهاتەیەك لە ژمارەکان دانانێن، بەڵام ناکرێ حاشاش لەوە بکرێ کە لە پاڵ کوارك (Quarks وردیلە مادەیەکە کە پێکهێنەری بنەمایی مادەکانە)و کواسارەکان (Quasars هەسارەناسای ئاسمانی زۆر دوورن کە شەپۆلی رادیۆیی بەهێز دروست دەکەن)، ژمارەکان رۆڵێکی ئاراستەییان هەیە. فەیلەسوفێکی پێش سوقرات کە لە بنیاتنانی بیرۆکەی زانستی ئەمڕۆدا رۆڵێکی زۆری هەبووە "دموکریتۆس" بووە. جیهانی بە پێکهاتەیەك لە ...

گەردیلەکان دادەنا. زیاتر لە دوو هەزار ساڵی خایاند تا زانایان‌و بیرمەندان گەڕانەوە بۆ ئەم روانگەیە.

"ئەنکساگوراس"بە یەکەم فەیلەسوفی ئەسینایی ناوی دەبرێت هەرچەند بە رەچەڵەك خەڵکی ئاسیای بچوك بوو، بە هۆی بانگهێشتی

پـــریکلیس (Pericles سیاســەتمەداری ئەســینایی کــە لــە دەورەی ١٥ ساڵەی حکومەتەکەی لە ئەسینا گەیشتە ئەوپەڕی دەســەڵاتی سیاســیو ڕۆشنبیری) بۆ ئەسینا بانگهێشت کرا تا پەروەردەی خــەڵکی ئەسینا لــە ئەســتۆ بگرێــت. ئەنکساگۆراس فەیلەسوفێکی زۆر بەرجەســتە نــەبوو. ئەوە یەکەم فەیلەسوف بوو کە لە بری شرۆڤەی جیهان لە سەر بنەمای یەکبوونێکی جیهانی بووە پێداگری ڕەگـەزێکی زۆری مـادە بـۆ جیهـان. لە ڕاستیدا دەیوت هەر شتێك بەشێکە لـە شـتێکی تـر و تـا ئـەو ڕادەیـە چووە پێشەوە کە تەنانەت ئەستێرەکانیش خاوەن ڕۆحێکی تایبـەت بـە خۆیـانن، دەیـوت بـەفری سـپی بەشـێکە لـە ڕەشـیو ئـاو بەشێکە لـە وشکانی. سەرەڕای ئـەم قسانە ئەنکساگۆراس کەسایەتیەکی گـرنگ بـە ئـەژمار دەهـات هـەروا بـواری فەلـسەفەی بـە ڕووی کۆمەڵگـەی ئەسـینا کردەوەو تەنانەت بـە مامۆستای سـوقرات نـاوی لێدەبـەنو دەڵێن ئـەو فەلـسەفەی بـە سـوقرات ناسـاند. بـە هـۆی سەرچـاوەیەکی مێـژوویی ئەنکـساگۆراس وانـەی بــە پــریکلیس وتووەتــەوە کــە ڕێبــەری سیاســی سەردەمی ئاڵتۆنی ئەسینا بووە (لە نێوان دەیەی ٤٤٠ بۆ کۆتـایی دەیـەی ٤٣٠ پێش زایین). ئەم سەردەمە هـەمان سـەردەمێکە کـە "پـارتینۆن"ی تیـا دروسـت کـرا (Parthenon پەرستـشگەیەکە لـە ئەکرۆپولیـسی ئەسینا کە لە سەدەی "٥"ی پێش زاینو بۆ پەرستشی خوای بیرو فکر دروست کراو لـە ڕیـزی شاکارە بیناسازییەکانی یۆنـانی دێرینـە)و لـەو سەردەمەشـــدا تراژیـــدیای یۆنـــان گەیـــشتە لوتکـــە. لـــەم ســـەردەمەدا "فیدیاس"ی پەیکەرساز شـاکارەکانی خولقانـدو فەلـسەفەی کلاسیکی

یۆنان بە هۆی سوقرات پشکوت. رادەی کاریگەی ئەنکساگۆراس لە سەر پریکلیس بە باشی نازانین، بەلام لەوە ئاگادارین دەرمنجام بە هۆی پێداگری لە سەر ئەوە کە خۆر بەردێکی زۆر گەورەی درەوشاوە بووە و مانگ لە جسنی زەوییە، لە ئەسینا بە تاوانی کفرکردن بە دوایدا دەگەڕان و ناچار بوو هەڵبێت. هەر ئەم کارەش بووە هۆی ئەوە فەلسەفە لە ئەسینادا بە چاوی جدی سەیر بکرێت و بە مەترسیدار دەست نیشان بکرێت.

ئەنکساگۆراس وانەی فەلسەفەی بە سوقرات وت بە شێوەیەك کە فەلسەفە هەم جدییە و هەم مەترسیدار، بەلام بەو جۆرەی دەیبینین سوقرات گرنگی بە قسەی مامۆستاکەی نەدا. گرنگی نەدانی سوقرات بە یەکەم وانەی مامۆستاکەی ئەوی بە بەرچاوترین کەسایەتی فەلسەفی هەموو دەورانەکان برد، بەلام گرنگی نەدانی بە دووهەمین وانەی مامۆستاکەی گیانی لە سەر دانا.

تەنها سەدەیەك پێش دەسپێکی فەلسەفە لە یۆنانی کۆن دەگەینە پشکۆترین سەردەمی فەلسەفەی ئەم شارستانیەتە. ئەم سەردەمە شایەتحالی دەرکەوتنی سێ روخساری بەرجەستەی فەیلەسوفەکانی جیهانە. یەکەم کەس لەم سێ کەسە سوقراتە کە ئەوەندە کاتی تەرخان کرد بۆ وتنی فەلسەفە لە شەقامەکانی ئەسینا کە ئیتر کاتی نەبوو بنووسێت. ئەمەش تەنها بە هۆی ئەفلاتوونی قوتابیی سوقرات لەم شتانە ئاگادارین کە نووسیویەتی. لە نێوان ئەم نووسینانەش زۆرجار بە زەحمەت تێدەگەین کە کام دەنگ تایبەت بە سوقراتە و کام یەکەیان

تایبەتـە بـە ئـەفلاتوون کـە لـە زاری سـوقراتەوە بـەیان بـووە. ئـەو شێوازەی کە سوقرات لە باسەکانی کەڵکی لێوەر دەگرت بریتی بـوو لـە پرسیارە بەردەوامە هێرشبەرەکانی بە پەرچدانەوەی نێگەتیف کە پێی دەوترا دیالکتیك‌و بە پێشەنگی مـەنتق دەژمێـردرا. سـوقرات دەیویـست بـەم شـێوازە بـۆ بەرنگاربوونـەوە لـە گـەڵ کەسـی بەرامبەریـدا بـە حەقیقەت بگات. ئەفلاتوون رۆحی ئەم باس‌و خواستانەی هێنایـە نـاو گفتوگـۆی رۆژانـە. ئـەفلاتوون لـە سـەر ئـەو بـاوەڕە بـوو کـە جیهـانی راستەقینە پێکهاتەیەکە لە نموونەکان‌و ئەم جیهانەش ئێمە دەیبینین‌و ئـەزموونی دەکـەین تـەنها سـێبەری نموونەکانـە. سـەرەڕای ئـەم بیروبۆچوونە حەقیقـەت ناسایانە زۆربـەی خـاوەن بیروڕاکان بڕوایـان وایە هەموو فەلسەفەکان شتێك نیە جیا لـە پـەراوێز نووسـین لـە سـەر بابەتی بەرهەمەکانی ئـەفلاتوون. هەرچـەند ئەمـەش بۆچـوونە، بـەڵام رەنگە راست بێت ئەگەر بڵێین ئەفلاتوون یەکەم کەس بوو کە زۆربـەی مەسـەلە فەلـسەفیەکانی ریزبەنـدی کـردووە کـە تـا ئـەمڕۆ باسـی لێـوە کـراوە ((هەڵبـەت ئـەفلاتوون دەبـێ لـە روانگـەی کەسـانی دەرەوەی کۆماریەکان شیبکرێتەوە)).

سێیەم ئەنـدامی ئـەم گروپـە سـێ کەسـیە گەورەیـە کـە لـە فەلـسەفەدا ناودارن "ئەرەستۆ" قوتابیی ئەفلاتوونـە. ئەرەسـتۆ شـێوازی گفتوگۆی ئەفلاتوونی رەد کـردەوە بـۆ دەربـڕینی فەلـسەفە. لـە لایەکـەوە بابـەتی فەلـسەفی زۆری نووسـی کـە بـە داخـەوە زۆربـەیان لـە دەسـتی ئـەو قوتابیانەدا بوو کە بایەخی فەلسەفەیان نەدەزانی. یاسای بیرکردنـەوەو

پۆلێن کردن کە ئەرستۆ داینا، بووە بنەمای بیرۆکەی فەلسەفی و زانستی بۆ دوو هەزار ساڵ دوای خۆیو لەم دواییانەشدا هەندێ بیروڕای شیدەکرێتەوە. وادیارە ئەرستۆ لەوە تێگەیشتبوو هەموو شرۆڤە گشتیەکان سەبارەت بە جیهان دەرمنجام بە شێوەی هەڵە دێتە ئارا. ئەمەش نەبووە هۆی ئەوە کە خۆی هەوڵنەدات بۆ شرۆڤەی گشتی ئەم مەسەلانە.

بە بێ فەلسەفە نەماندەتوانی بە رادەیەك بگەین کە ئێستا تیایدا راوەستاوین ئەوەش لە یۆنانی دێرین دەستی پێکردو تایبەتمەندیی یۆنانی خۆی لە نێوان سەدەو دەورانەکاندا پاراست. زانستی ئەمڕۆمان نەدەزانیو هەوڵمان دەدا بۆ بەدەستهێنانی راستیەك کە بە گشتی بە شێوەی خەیاڵو هەوەس دەمێنێتەوە چونکە ئەمڕۆکە زانست ریزێکە لە : سیاسەتو ئابوریو دەروونناسی. تەنانەت زانستی ئەخلاق سەرەڕای سەرنجی بەردەوامی فەلسەفە لە سەدەو دەورانەکان بەمشێوەیە سست بنەما ماوەتەوە. ئەمڕۆکە لە بواری ئەخلاقی نەك هەر لە دۆخێکی باشتردا نین بە گوێرەی رابردوو بەڵکو تەنانەت نازانین بە چ شێوازێك دەتوانین باشتر و والاتر بین. نزیکەی (٢٥) سەدە پێویست بوو بۆ باش تێنەگەیشتنو هەڵەی فەیلەسوفەکان کە سەرنجیان بخرێتە سەر ئەم خاڵە، ئەو شتەی گرنگە خۆ لە خۆیدا تێگەیشتنی خراپ نیە بەڵکو ناخی بیرکردنەوەیە لە فەلسەفە کە گرنگە. بەمجۆرە فەلسەفە لە ئاراستەی چالاکییەکە بۆ بەدیهێنانی دەرمنجامە گوماناوییەکان. ئێستا بە جاری یەکەم لە مێژووی

فەلسەفەدا وادیارە کە سازدانی سیستمی فەلسەفی کارێکی بێهۆدەیە. ئەم نەریتـــەی ئـــەفلاتوونو کانـــتو ئەنێـــسواردو ویتگینـــشتاین کۆتـــایی پێهـاتووە. ئـەم نـەریتی بیـنینو بیرکردنـەوە کـە بـە درێـژایی مێـژوو باشترین بیرۆکەی مرۆڤایەتی لـە خـۆ گـرت لەگەڵ سوقرات دا بـوو کـە پێگەیشت.

## ژیان و بەرهەمەکانی سوقرات:

ســوقرات لــە ســاڵی (٤٦٩)ی پ.ز لــە دێهاتێــك لــە پــاڵ کوێــستانی "لیکابتۆس" لە دایك بوو کە ماوەکەی تا ئەسینا بە ئەندازەی (٢٠) خولەك پیاسە کردنە. باوکی پەیکەرسازو دایکی مامان بوو. سوقرات لە سەرەتای ژیانی بۆ ماوەیەك قوتابی بەر دەستی باوکی بوو تەنانەت بە پێی هەندێ سەرچاوە سوقرات بۆ ماوەیەك کاری لە سەر پەیکەری کچەکانی "زیۆس" دەکرد لە "ئاکرۆپولیس". پاشان بۆ خوێندن نێردرا بۆ لای "ئانکساگۆراس".

لە سەر بنەمای نووسینەکانی "دیوگنیس لارتیۆس" ژیاننامەنووسی رۆمی سەدەی سێ ی زایینی سوقرات بۆ درێژەدان بە وانەی فەلسەفە چووەتە لای "ئارکلایۆس". کاتێك ئانکساگۆراس بە هۆی ئەو هەراوهووراى نایەوە کە بڕوای وابوو زەوی لە گۆیەکی درەوشاوە جیا بووەتە ناچار بوو لە ئەسینا هەڵبێت، بەڵام "ئارکلایۆس" کە تەنها پەیوەندی فکری لەگەڵ قوتابیەکانی هەبوو بە ئازادی بیری لە کاری خۆی دەکردەوە.

سوقرات لە لای ئارکلایۆس فێری بیرکاریو ئەستێرەناسیو وانەی فەیلەسوفەکانی رابردوو بوو. لەو دەمانەدا تەمەنی فەلسەفە لە یۆنانی دێرین دا یەك سەدەی پڕ کردبووەوەو لە بواری نوێگەرییەوە وەك فیزیای ناوەکی ئەمڕۆکەی خۆمان وابوو. جیهانی فەلسەفەی ئەم دەمانە (بە بیرۆکەیەك وەك ئەوەی جیهان لە ئاو یان ئاگر یان هەوا پێکهاتووە) هیچ پەیوەندییەکی بە ژیانی خەڵکەوە نەبوو. رێك وەك ئەم سەردەمە کە فیزیای ناوەکی پەیوەندی بە ژیانی رۆژانەی خەڵکەوە نیە بەڵکو بە گشتی کاریگەری لە سەر وڵات یان جیهان دادەنێت ئەوسایە کە جیهان دەتەنێتەوە. بۆ نموونە کاتێك بەرامبەر بە بوونی خۆمان بیر دەکەینەوە بە زەحمەت بیر لە "مێزۆن" دەکەینەوە کە (Meson بەشێکە لە گەردیلە بنەماییەکانی مادە). وادیارە خەڵکی یۆنانی دێرین بەرامبەر ئەم بیرۆکانە کە جیهان لە ئاو یان ئاگر یان هەوا دروست بوو بێت پەرچدانەوەی خۆیانیان هەبووە.

سوقرات بەو ئەنجامە گەیشت کە بیرۆکەی لەم جۆرانە سەبارەت بە سروشتی جیهانی هیچ گەرەنتیەکی تیا نیە لە بەرژەوەندی مرۆڤدا بێت. لە روانگەی بیرمەندێکی بە رواڵەت ژیرگەرا، سوقرات بیرۆکەی دژە ئاینی هەبووە. لەم بوارەوە بە دڵنیاییەوە بیرۆکەی سوقرات لە بیرۆکەی "پارمیندۆس"ی فەیلەسوف سەرچاوەی وەگرتووە کە خەڵکی "ئەلیا" بووە. تەنانەت وتراوە کە سوقرات وانەی لە لای پارمیندۆس خوێندووە کە هەندێ شتی لێیەوە فێر بووە. پارمیندۆس روانگە جۆراوجۆرەکانی فەیلەسوفانی وەلاوەنا کە لەبارەی سروشتی جیهان

وترابوو کە جیهان لە ئاو یان ئاگر یان هەوایە کە زیاتر ئانکساگۆراس جەختی لە سەر دەکردەوە، بەڵام سوقرات گوێ بەوانە نەدەدا. لە روانگەی پارمنیدۆسەوە ئەو جیهانەی دەیبینین تەنها خەیاڵە. لەمڕووەوە مەسەلەی سەرەکی ئەوە نیە کە جیهان لە چی دروست بووە چونکە ئەم جیهانە لە بنەمادا (لە دەرەوەی زەینماندا) نیە. تەنها راستییەکی سەرەکی ئەوەیە کە ئێمە بوونێکی هەمیشەیین. بە لای بوونێکی لەمشێوەیە، داهاتوو و رابردوو بوونی نیەو هەموو جیهان لە خۆ دەگرێت. بنەمای سەرەکی پارمیندۆس ئەمە بوو : هەموو شت یەك شتە. ئەو ئالوگۆڕەی لە جیهاندا دەیبینین تەنها رواڵەتو دەرکەوتەیەکە لەم بوونە. روونە روانگەیەکی وا بەرامبەر بە جیهان بە زەحمەت لە لایەن زانستی سروشتیەوە پەسەند دەکرێت. ئەگەر روانگەیەکی وا راست بێت ئیتر بۆچی زەحمەتی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لەبارەی جیهانەوە بخەینە سەر شان خۆمان کە خەیاڵو خەون بێت.

لەو سەردەمە سەرەتاییەدا فەلسەفە هەموو زانستەکانی لە خۆ گرتبوو. ( لە زمانی یۆنانی دا فەیلەسۆف بە واتای لاینگرو خۆشەویستی بۆ زانایی"یە. ئەوەش بەو مانایە دێت کە لقە زانستیەکان وەك بیرکاریو ئەستێرەناسیو زانستی سروشتی هیچ کامەیان بە شێوەی سەربەخۆ بوونی نیە بەڵکو بۆ چەند سەدەیەك هەموو ئەم زانستانە بەشێك بوون لە فەلسەفە. تەنانەت لە کۆتاییەکانی سەدەی (١٧)ی زایینیدا نیوتون ناوی شاکارەکەی خۆی ناو نا "بنەمای بیرکاری فەلسەفەی

سروشتی"، بەڵام وردە وردە بەو رادەیە گەیشت کە فەلسەفە سنوردار کرا بۆ خوێندنەوەی مەسەلەی متافیزیایی واتە ئەو پرسیارە بێ وەڵامانە. هەر کات فەلسەفە وەڵامێکی بۆ پرسیارەکان دەدۆزیەوە ئەو وەڵامە خۆ لە خۆیدا لە چوارچێوەی فەلسەفە دەچووە دەر و خۆی دەبووە مەسەلەی فیزیا یان بیرکاری. نوێترین نموونە بۆ ئەم ئاڵوگۆڕە زانستی دەروونناسیە کە پێداگرە لە سەر وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە کە سەبارەت بە دەروونی مرۆڤ بووە و خێرا وەك لقێکی نوێ لە زانستی سەربەخۆ خۆی راگەیاند. (لە راستیدا دەروونناسی ئامرازی فەلسەفی نەبوونی لە بەر دەستدایە چونکە هەندێ بنەمای نیە کە بتوانرێت ئەزموونی لێ وەربگیردرێت. ئەم تایبەتمەندییانە لە خەیاڵی پارانۆیا دەبینرێن، ئەو چارەسەرییە دەروونشیکاریانەی بۆ دابەزینی هوشیاریو تێکچوونە دەروونیەکانی تر بەرچاونو دەبینرێن).

لە کاتی سوقرات دا هەڵبەت هێشتا دەروونشیکاری بەشێکە لە فەلسەفەو تەنانەت ئەو کات فەیلەسوفەکان لە چاوی خەڵکی ئەسینادا وەك پزیشکە دەروونیەکان بوون لە چاوی خەڵکی ئەمڕۆدا. روانینی سوقرات بۆ فەلسەفە بە گشتی روانینێکی دەروونناسانە بوو ( لە زمانی یۆنانی دا وشەی سایکولۆژیا بە واتای خوێندنەوەی زەینە)، بەڵام سوقرات کاریگەریی پارمیندۆسی لە سەر بوو. راستیەکان لە روانگەی سوقرات تەنها خەونێك بوون. ئەم باوەڕە کاریگەریەکی نێگەتیفی لە سەر سوقراتو قوتابیەکەی ئەو (ئەفلاتون) دانا. زانست لە سەردەمی ئەودا تەنها لە بیرکاری پێشکەوت. هۆکارەکەشی تەنها ئەوە بوو کە

بیرکاری بابەتێکی سەربەخۆ و جیاواز بوو لە کاتو بە شێوەیەك لەو پەیوەندییەدا بە بوونێکی تەواو دادەنرا. لە لایەکەوە ئەرەستۆ بە بنیاتنەری زانست دانراو فەلسەفەی بەرەو خوێندنەوەی جیهانێکی راستەقینە برد. سەرەڕای ئەمانەش روانگەی سوقرات تا ئێستاش سێبەری خۆی لە سەر جیهانی فەلسەفە پاراستووە.
لە ژێر کاریگەریی سوقرات دا ڕێژەیەك فەیلەسوف لە چوارچێوەی فەلسەفەدا مانەوە: ئەرەشمیدۆس لە فیزیادا، بوقرات لە پزیشکی دا، ئوقلیدۆس لە هەندەسەدا. زانایانی یۆنانی دێرین ئاگاداری ئەوە بوون کە زەوی بە دەوری خۆر دەسوڕێتەوە، دەیانزانی زەوی گۆیەو تەنانەت رووبەرەکەشیان حساب کردبوو و لێی ئاگادار بوون. هێزی ئەلێکتریسیتەیان دۆزیبووەوەو لە هێزی موگناتیسی زەوی ئاگادار بوون. هەروا لە دەرەوەی چوارچێوەی بەربلاوی فەلسەفە هەموو ئەم مەسەلە زانستیانە بە واتای مەسەلەی پەرش و بلاو لە پەراوێز دانرا.
ئێمە لەم روانگەیەوە کە سوقرات فەلسەفەی لە سەر بنەمای پتەوی عەقڵ بنیات نا قەرزاری ئەوین، بەلام لە هەمان کاتدا کاتێك فەلسەفە لە ژێر کاریگەری تاکەکەسیی دژە زانستی پەروەردە کرا دەبوایە بە یەکێ لە بەختەوەرییە گەورەکانی مرۆڤ بژمێردرێت. رەنگە بە زەحمەت بتوانرێت دەرفەتێکی وا کە لە دەست چووە بە باشی بە دەست بێتەوە. تا رادەیەك پێویستە سەرنج بخەینە سەر ئەوەی ئەگەر ئەو هەوڵەی دراوە بۆ بیرکردنەوە کە چەند فریشتە لە سەر دەرزییەك

جێیان دەبێتەوە، دەگرا ئەو کاتە بۆ ئەتۆم و ناوك تەرخان بکرێت کە دموکریتۆس خستبوویەڕوو.

سوقرات بڕوای وابوو لە بر ئەوەی پرسیار بکەین سەبارەت بە چۆنیەتی و خولقاندنی جیهان، باشتر وایە سەبارەت بە خۆمان پرسیار بکەین ((هەڵبەت ئەمە بۆچوونی ئەوە بۆچوونی هەموو فەیلەسوفێك نیە یان مەرجێك نیە ببێتە پێوانە بۆ پرسیارو هەموو جۆرە روانگەیەکی فەلسەفی)). ئەمەی بە دروشمی خۆی دانابوو:" خۆت بناسە". (هەندێجار دەڵێن سوقرات ئەمەی وتووە، ئەگەری هەیە تایبەت بێ بە یەکەم فەیلەسوف، تالیس. لە لایەکی تر ئاگاداری ئەوەین ئەم وتەیە لە سەر پەرستشگەی "دلفی" نووسراوە.)

سوقرات لە "ئەگۆرا"دا – Agora: فلکەی گشتی و شوێنی بازاڕی سەرەکی شار بوو لە هەموو شارە کۆنەکانی یۆنان دا- کە هێشتا شوێنە خاپوورەکانی لە خوارووی ئەکروپولیس- موە دیارە، دەستی کرد بە باس و ویستی فەلسەفەکەی خۆی. شوێنی زۆر خۆشی سوقرات بازاڕی زیوس ئەلوتریۆس بوو کە ریزێك کۆڵەکەی بەردینی لێبوو و فرۆشیاران لەوێ خرت و پرتی خۆیانیان رادەخست. بنەمای ئەم کۆڵەکانە هێشتا لە لەم شوێنەدا بە ئاسانی دەبینرێت. ئەم شوێنە لە کۆتایی ترین شوێنی باکووری دا لە رێگای ئەسینا بەرەو پیرایۆس دەرِوات و دەگاتە ئەوێ. ئەمرۆکە تەیمانەیان بە دەوریدا کێشاوە وەك شوێنی ئارام دێتە بەرچاو، بەڵام دەنگی گەشتیاران و کابینەکانی (موناستراکی) ئەوێ کە شتی تیا دەفرۆشن دیارە. پێموایە ئەم هەراو

هوورایە بە ئەندازەی هەمان هەراوهووورای سەردەمی خودی سوقراتە.
وا وێنانەی دەکەین کە سەردەمی سوقرات فەلسەفەکەی خۆی لە ناو هەراوهووورای فرۆشیارەکانی جلو بەرگو کابینەکانی ئەو سەردەمەو فرۆشیارانی چەرەساتو خواردن بڵاو دەکردوەو بۆ خەڵکی باس دەکرد، بەڵام سەرەڕای ئەم هەراوهوورا و قەرەباڵغیە بە دڵنیاییەوە دەنگی سوقرات بە گوێی بیسەرانی گەیشتووەو ئەگەری ئەوەش لە ئارادا بووە سوقراتی گەنج بە فەلسەفەکەی خۆی شەپۆلێکی لە کۆمەڵگای ئەسینادا هەژاندووە چونکە کاتێك هێشتا گەنجێکی تەمەن (٣٠) ساڵان بوو کابرای پێشگۆی پەرستشگەی ئەسینا ئەوی بە زاناترین پیاوی ئەسینا داناوە.
سوقرات بێ بڕوایی باوەڕی خۆی بەرامبەر بە وتەی پێشگۆی پەرستشگەکە دەردەبڕیوەو وتوویە:" من هیچ شتێك نازانم تەنها ئەوەندە ئەزانم کە هیچ نازانم." بەڵام بە مەبەستی زانینی ئەوەی کە ئایا راستیەك لە وتنی پێشگۆکەی پەرستشگەی دلفی دا هەیە یان نا، بۆیە دەستی کرد بە توێژینەوە لە زاناکانی ئەسینا تا بزانێ ئەوان تا چ رادەیەك لە راستیەکان تێگەیشتوون. سوقرات باوەڕە ناڕاستەکانی خەڵکی بە کارامەیی دەدرکاندو لەوبارەوە دەستێکی باڵای هەبووە.
شێوازی ئەو وابوو کە سەرەتا دەیوت لەبارەی ئەم مەسەلەیە کە باسی دەکەین هیچ نازانم پاشان داوای لە رکەبەری خۆی دەکرد بە وردی لەبارەی مەسەلەکە باس بکات ئەوسا سوقرات بە پرسیارەکانی خۆی بڵقی هەڵەو خەیاڵی ناڕاستی رکەبەرەکەی ئاشکرا دەکرد. پرسیارەکانی

سوقرات قووڵ‌و بەردەوام بووە. هەوڵیداوە بە دەسپێکردن لە بنەمای سەرەکییەوە بە راشکاوی گفتۆگان بە دەست بێنێت. ئەمەش بەو واتایە بوو کە واتا بنەڕەتیەکانی کەسی رکەبەر کە لە سەر ئەو بنەمایە بیروباوەڕی خۆی سەقامگیر کردبوو دەبوایە بە وردی وەسف بکرایەو شیبکریانەوە، نەگونجاوی‌و ناکۆکیەکانیان‌و درکاندن‌و دەرەنجام‌و پەیڕەوەکانیان دەست نیشان دەکرا، بەڵام سوقرات روانینێکی وردبینانەی بەرامبەر لاوازیەکانی مرۆڤ هەبوو- ترسیشی لەوە نەبوو کە رکەبەرەکەی بکاتە گاڵتەی دەستی ئەم و ئەو. بە گشتی وادیارە سوقرات دەبوایە کەسی رکەبەر باسی توندوتیژ وروژێنەر و گێژکەر بووەو لە هەمان کاتیشدا زۆر هوشیار بووەو هیچ گومانی تیا نیە کە ئەم پروپاگەندەیەو سەرەڕۆییەی دوژمنە جۆراوجۆرەکان بۆی دابین بکرێت‌و لە لایەکی دیکەوە بووە خۆشەویستی گەنجانی یاخی‌و ئەو گەنجانەی داب‌و نەریتیان تێکدەشکاند.

ئێستا سوقرات بۆ رازیکردنی خۆی توانیبووی پیشان بدات کە پیاوە زاناکانی ئەسینا بە قەد ئەو لە فەلسەفەیان نەدەزانی. لەوڕووەوە وا بیری کردەوە کە پێشگۆی پەرستشگەی دلفی ئاگاداری مەسەلەکان بووە کە بە زاناترین پیاوی ئەسینای بناسێت چونکە لانیکەم بە باشی دەیزانی کە هیچ نازانێت.

هەرچەند سوقرات لە روانینەکانیدا بەرامبەر مەسەلە فکریەکان کەسێکی تێکشکێنەری داب‌و نەریتی عەقڵ گەرا بوو، بەڵام لە زۆر بوارەوە بە کەسێکی ئاسایی سەردەمی خۆی دادەنرا. هەرچەند رەنگە

کەسێکی سەیر بهاتبایە بەرچاو بەڵام سوقرات بە دڵنیاییەوە بڕوای وابوو کە پێشگۆی پەرەستشگەی دلفی لە زمانی خواکانەوە قسەی دەکرد. هەروا بڕوایەکی قووڵی بۆ نەمری وزە هەبوو و بڕوای وابوو کە پاش مردن وزەمان لە جیهانێکی تردا درێژەی پێدەدرێت. سەرەڕای ئەمانەش ئەوەندە گرنگی بە خواوەندە ئەفسانەییەکانی یۆنان نەدەدا. فەلسەفەکەی سوقرات لە توێژینەوەی دەرەنجامی بیرۆکەیی‌و شێوەی شیکردنەوە شرۆڤە ناکرێت بەڵکو رێژەیەك سەلماندنی سەقامگیری لە خۆی بەجێهێشت. وادیارە لەم رێگایەدا تووشی رەخنەکانی خۆی بەرامبەر بە خۆی بووەتەوە. لە گفتوگۆی "فایدۆن" بە قەڵەمی ئەفلاتوون، سوقرات بیرۆکەی نموونەهێنانەوە گەلاڵە دەکات. زۆر کەس لە سەر ئەم بڕوایەن ئەمە لەم بوارانەدایە کە ئەفلاتوون بیرۆکەکانی خۆی لە زاری سوقرات بەیان دەکات، بەڵام باشتر وایە سەرنجی ئەوەش بدەین ئەو کاتانەی ئەفلاتوون نامیلکەی فایدۆنی نووسی — هەموو ئەو کەسایەتیانەی لەم گفتوگۆیەدا بەشدار بوون هێشتا زیندوو بوون. لەمڕووەوە دەکرێ ئەگەری ئەوە رەچاو بکەین کە بیرۆکەی هەر کەسێك لەم گفتوگۆیەدا لە راستیدا باوەڕی خودی ئەو کەسایەتیانە بووە جیا لەوە وا بیر بکەینەوە ئەفلاتوون ئارەزووی هەبووە راکێشی دادگا بکرێت، لە سەر ئەم باوەڕە ئەگەری هەیە ئامادەبوان لەم وتووێژەدا باسی باسکراویان لە بەردەم سوقرات دا خستووەتەڕوو. لە سەر ئەو بنەمایە کە ئەفلاتوون قسەکانی ناو نامیلکەکەی بە گشتی لە سەر بنەمای سەرچاوە راستیەکان بە سەقامگیری داینـاوە. ئەفلاتوون

جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە سوقرات "زۆرجار ئەم مەسەلانەی دەخستەڕوو". سەرەڕای هەموو ئەمانە، بیرۆکەی نموونە زۆرجار دەگەڕێتەوە بۆ خودی ئەفلاتوون.

ئەگەر کەسێك خۆی بە دەستی خۆی شتێکی نەنووسی بێت، دژوارە کە بە ناویەوە شتێك بوترێت یان شتێکی بدرێتە پاڵ، بەڵام لەبارەی بیرۆکەی نموونە: شتێکە نە سوقراتو نە ئەفلاتوون یەکەم کەس نەبوونە لەبارەیەوە بیری لێدەکەنەوە بەڵکو شانازیەکەی رەنگە بگاتە فیساغۆرس. وەك بینیمان توێژینەوەکانی فیساغۆرس لەبارەی هارمۆنی مۆسیقاییەکانیەوە وای لێکرد بڕوای وابێ جیهان لە بنەمادا لە ژمارە پێکهاتووە. وێناکردنو هەڵسەنگاندنی فیساغۆرس سەبارەت بە ژمارەکان زۆر هاوشێوەیە لەگەڵ هەڵسەنگاندنمان بەرامبەر بە "نموونە". لە سەر بنەمای ئەو بیرۆکەیە ئەم ژمارانە راستیەکی شاراوەنو هەم بیرۆکەی نەگۆڕ کە هەموو راستیە بەرچاو و بەردەوامەکان بۆ گۆڕینی جیهانیان دروست کردووە.

لە گفتوگۆی فایدۆن دا سوقرات سروشتی جیهانی "نموونە" دەخاتەڕوو. ئەو وشە یۆنانیەی ئەو بە کاری دەهێنا ئایدۆس "Eidos"ە. ریشەی ئەم وشەیە (IDEA) یە کە لە زاری ئەورووپیەکاندا دێتە دەرو دەکرێ بە شێوەی وێنەو وێنەی جووڵاو بێتە ئارا. ئەم وشەیە هاوکات واتای ژمارەو نموونە پێکەوە دێنێتەوە. سوقرات دەیوت جیهانی نموونە لە رێگای هەستەکانمانەوە هەستی پێناکرێتو بەرامبەر بەوەش تەنها لە رێگای زانستەوە دەکرێ

بیدۆزیتەوە. بۆ نموونە لەبارەی هەندێ بابەت وەکو خڕبوون یان سووربوون بیری لێبکەینەوە لە حاڵێکدا نە خڕبوون نەش سووربوون هەستی پێ ناکرێت تەنها لە ڕێگای هەستەکانمانەوە نەبێت. بۆ نموونە دەتوانین تۆپێکی خڕ کە ڕەنگەکەی سوورە ببینین.

ئەم تێگەیشتنەمان لە تۆپی خڕ و ڕەنگ سوور لە ڕێگای نموونەی سووربوون‌و خڕبوون‌و ... هتد بەدەست دێت، بەڵام بە چ شێوەیەك وا دەرەنجامێك بە دەست دێت؟ لە ڕوانگەی سوقراتەوە هەر شتۆمەکێکی تایبەت ئەو تایبەتمەندییانەی کە هەیەتی لە ڕێگای بەشداریکردن لە نموونەیەك کە سەرچاوەی لێدەگرێت بە دەست دێت. ڕێگایەك بۆ شرۆڤەکردنی ئەم مەسەلەیە کەڵك وەرگرتنە لە نموونە چوارچێوە بۆ چوارچێوەدانان. ئەو نموونە گشتیانە پێوانەیەکی چوارچێوەیین کە شتۆمەك‌و مەسەلە بەرچاوەکان‌و ئەندازەو چۆنیەتیەکانی تریان لەوانەوە بەدەست دێت.

جیهانی نموونەیی تەنها جیهانی ڕاستەقینەیەو ئەوەش ئایندەیەکی دوورە کە هەموو شتۆمەکەکان‌و بوونەوەرەکان تیایدا بەشداری دەکەن. لە جیهانی ڕیزبەندی دا ئەو شتانە زاڵن‌و لە سەرووی هەمووشیانەوە نموونەی چاکەو جوانی‌و ڕاستیەکان. هەندێ چۆنیەتی وەك چاکەو جوانی و ڕاستی کە بەرامبەر بە بوونی ئەوانە لە مەسەلە جۆراوجۆرەکان کە لێیان ئاگادارین بەرەو تێگەیشتنی تەواو دەڕوات. ئەمەش ڕوانینێکی نهێنی ئاسایە بەرامبەر بە جیهان کە تیایدا ڕەنگدانەوەی ئەو بیرۆکە هیندوویيە ببینرێت کە هەموو ڕوانینی

جیهانی بوون بە نموونەی خەیاڵیو نەخشێنراو لە سەر پەردەی (مایا) دادەنێن، ئەو پەردەیە کە تەنها مرۆڤە نوخبەو شیاوەکانی تیا دەردەکەون. دوور نیە سەرچاوەی سەرەکی ئەم فێرکارییەی سوقرات ئەو بیرۆکە هیندوویی بوو بێت. لە روانگەی سوقرات ئەم ئایندەیە هەمان جیهانی والایە کە هانمان دەدات بیناسین.

بەختەوەرانە سیستمی بیرکردنەوەی وا دوور و درێژ کە حاشا لە لایەنی راستیو بەرچاو دەکات، بە گشتی دوور نیە لە وردبینی. چونکە ژمارەکانیان بە هاوشێوەی نموونەکان دادەنا، خوێندنەوەی ژمارە بە بالاترین کار دەژمێردرا، وابوو کە بیرکاری لە لایەن یۆنانیە کۆنەکان بە واتای چالاکیو زانستی رێزدارو رۆشنبیر دەژمێردرا، بۆ نموونە دیاریکردنی: بۆ پرکردنی تەنکییەك پێویستی بە چەند سەتڵ ئاو هەیە کە ئەوەش بە چالاکیەکی شیاو و بەرچاو ناژمێردرێت چونکە کارێکە پراکتیکی بوو هەروا بە کەڵکی ئەم جیهانە دەهات کە ناچار بووین تیایدا بژین. وابوو کە زانست بە شتێکی کەم بایەخ دانرا. ئەم شێوە روانینە بۆ زانست تا ماوەیەکی دوور و درێژ بە سەر کلتوری رۆژئاوادا زاڵ بوو کە هێشتا هەندێ لەو رەگەزانە دەبینرێن.

سوقرات لە سەردەمی پریکلیس ئەو کاتەی کە ئەسینا بەهێزترینو بەشارستانیەت ترین دەوڵەت شاری جیهانی یۆنان دەژمێردرا پەروەردە کرابوو. ئەو سەردەمە لە سەر هەموو رەوتە مێژووییەکانی مرۆڤ کاریگەری دانابوو. جیا لە بەرهەمی گرنگ کە لەم سەردەمەدا دروست کرابوو، ئەم سەردەمە شایەتحاڵی دابینکردنی دیموکراسیو تەواوبوونی

بیرۆکەی زانستیو بیرکاری بوو کە هەڵبەت بە دەرکەوتنی سوقرات بووە دەرکەوتەی سەردەمی فەلسەفە.

سەردەمی ئاشتیو ئارامی ڕێژەیی سەردەمی پریکلیس بە دەسپێکی شەڕی پولوپۆنزی لە ساڵی (٤٣١)ی پ.ز کۆتایی پێهات. ((پولوپۆنزی: Peloponnesian ٤٣١- ٤٠٤ پ.ز زنجیرە شەڕێکی ناوخۆیی یۆنانی کۆن کە لە نێوان دەوڵەت شارەکانی ئەسینا لە لایەكو ئەسپارت لە لایەکی تر روویدا بوو تووشی شکست هات. ئەم بۆشاییە وێرانکەرەی نێوان دیموکراسی ئەسینا لە لایەكو ئەسپارتی سەربازی گەرا لە لایەکی تر بۆ چارەکە سەدەیەك درێژەی خایاند. ئەم شەڕە بە پەیڕەو ناوخۆییە سیاسیەکانی کاریگەریەکی گشتی و سەقامگیری لە سەر ژیانی سوقرات دانا. لە بیرمان بێ پەرچدانەوەی عەقلگەراییەکەی سوقرات لە بەرامبەر خورافەبوونو خەڵك هەڵخەڵەتاندنو دەسەڵاتی ترسێنەر بوو. بەداواچوونی بێوچانی سوقرات بۆ بەدەستهێنانی حەقیقەت لە سەردەمی گۆڕینی بەهاکانو لەرزاندنی بڕواکان ئەنجام دەدرا – ئەو سەردەمەی کە هەلومەرجەکەی بۆمان بە تەواوی ناسراوە.

بە دەسپێکی شەڕی پولوپۆنزی سوقرات بۆ خزمەتی سەربازی بە واتای سەربازی پیادەی پلە سێو ئامادە بە شمشێر و قەڵغان بانگهێشت کرا. سەرەڕای هەندێ بابەتی ناکۆك کە لە ژیانی سوقراتدا هەیە هەموان لەبارەی شێوەو روخساریەوە بۆچوونیان یەکە کە یەکێك بوو لە ناشیرین ترین پیاوەکانی ئەسینا. قاچی کەوانی و ورگی ئاوساو، شانو

ملی تووکن‌و سەری رووت، لووتی پان کە کونەکەی بۆ سەرەوەو چاوی دەرپووقیوو لێوی بۆ لای سەرەوە هەڵگەڕابوو.

سوقرات شێوەی وەك فەیلەسوفەکان بوو وەك ئەوانەش جلی لە بەر دەکرد. بێ گوێدان بە وەرزەکان لە زستان‌و هاویندا بەردەوام هەمان جلی کۆن‌و باڵاپۆشی کورتی دەخستە سەر شانی‌و بە پێ پەتی رێدەکرد. هاوکارە سوفەستاییەکەی بە ناوی "ئانتیفۆن" جارێکیان وتبووی "ئەگەر کۆیلەیەك ناچار بکەن بەمشێوەیە بژیت بەدڵنیاییەوە هەڵدێت". وادیاربووە سوقرات جەنگاوەرێك بوو بێت. ((سوفەستایی: گروپێك مامۆستا بوون کە بۆ فێرکردن پارەیان وەردەگرت‌و لە یۆنانی کۆن ناوبانگیان دەکردبوو بە ریکلامچی رێژەگەرایی ئەخلاقی‌و گومانگەرایی)).

رۆشنبیرانی ناشیرین‌و ئینکار لە سەر بیروڕای خۆیان بە گشتی کەسانێکی خۆشەویست نین لە لای خەڵك، بەڵام لە بەڵگەکان وادیارە سوقرات هاوڕاکانی سەردەمی شەڕی شەیدای خۆی کردبوو. لە گەمارۆدانی "پوتیدا"ی باکووری یۆناندا بەشداری هەبوو. کەشوهەوای ئەم ناوچەیە بە هۆی (با)ی سارد کە لە کوێستانەکانی (بولغاریا)وە دێت زۆر ساردو رچێنەرە. لەو زستانە ساردەدا هەموو سەربازەکان پێستی ئاژەڵی جۆراوجۆر بە خۆیاندا دەئاڵاندو پوزەوانیان لە پێ دەکرد کە لە خوری دروست کرابوو- بارودۆخێکی زۆر جیاوازیان هەبوو لەگەڵ وێنەی ئەو گەنجە رووت‌و ئازایانە کە لە سەر گوڵدانە گڵێنەکانی یۆنان دەنەخشێنران کە لە کاتی زۆرانبازی دا پیشان

دەدران. لە دۆخێکی وا تاقەت پڕۆکێن دا هاوڕاکانی سوقرات بە سەرسوڕمانەوە شایەتحاڵی ئەوە بوون کە سوقرات بە پێ پەتی لە سەر سەهۆڵو بە جلی دڕاو و باڵاپۆشی کۆنو کورت خەریکی ڕژە ڕۆیشتنە، بەڵام سەیرتر لەوەش بەلای هاوڕاکانیەوە سەیرکردنەکانی بوو لە کاتی بیرکردنەوەدا. لە سەر قسەکانی "ئالکیبیادیس" ((Alcibiades: ٤٥٠-٤٠٤ پ.ز ئەریستۆکراتی بزێوی یۆنانی بوو کە چالاکیە سیاسیو سەربازییەکانی دەرەنجام بووە هۆی کوشتنی)) کە خۆی لە گەمارۆدانی پۆتیدا لەگەڵ سوقرات بەشداری کردبوو ڕۆژێکیان سەرلەبەیانی سوقرات تووشی مەسەلەیەکی دژواری بیرکردنەوە دەبێت. هەموو هاوڕاکانی شایەت بوون کە بۆ ماوەی چەندین کاتژمێر لە شوێنێك خەریکی بیرکردنەوە بووە. پاش ڕۆژئاوابوون کاتی نانی شێو هێشتا هەر لەوێ مابووەوە. کاتی خەوتن چەند کەسێك لە رەفیقەکانی کە دەیانەوێ بزانن سوقرات تا کەی لەوێ دەمێنێتەوە لە دەرەوە چادرێکیان هەڵداوەو لەوێ خەوتوون. دەرەنجام ئەو شەوە تا بەیانی سوقرات بە هەمان شێوە تا سەرلەبەیانی بیری لە مەسەلەکانی ناو مێشکی کردووەتەوە. پاشان سەر لە بەیانی وەك وابێت شەو بە ئیسراحەت خەوتبێت بە دوای کارەکانی دا دەڕوات گوایە هیچ ڕووینەداوە.

ئەمە تەنها یەکێك بووە لەو ڕووداوانەی کە توانایی سوقرات پیشان دەدات بۆ خەلسەیەکی قووڵ. هەندێ بیروڕا لەم بوارانە بووەتە هۆی ئەوەی هەندێ خەڵك بیر لەوە بکەنەوە سوقرات تووشی کاتالیپسی

بووە ((Catalepsy: قۆناخێکی هیپنۆتیزمییە کە لە نێوان وریایی‌و خەودایە و لەوکاتەدا هەست‌و نەست پێکەوە کارا دەبن)). هەندێ بابەتمان لە بەر دەستدایە کە پیشان دەدات تەندروستی دەروونی سوقرات تەواو بووەو هیچ کێشەی نەبووە. لە راستیدا فەلسەفەی سوقرات هەندێجار تێکەڵەیەك بووە لە هوشیاریەکانی.

بەڵام لە هەمان کاتیشدا کە لەوپەڕی سستی‌و بێتاقەتی سەربازی توانیویەتی خەلسەیەکی وا قووڵ بۆ خۆی ئەزموون بکات لە کاتی خۆیدا توانیویەتی ئازایەتیەکی گەورە لە خۆی پیشان بدات. لە سەر قسەکانی ئالکیبیادیس کە لە شەڕێکدا خۆی برینداردەبێت، سوقرات دێت‌و لە سەر شانی خۆی دایدەنێت و بە بێ ترس لە ناوەڕاستی هێزی دوژمن تێپەڕ دەبێت‌و دەبێتە هۆی رزگارکردنی.

ئەفلاتوون دەڵێت سوقرات لە چاوی ئالکیبیادیس دا زۆر خۆشەویست بوو. جارێکیان ئالکیبیادیس دەڵێت:" کاتێك دەنگیم دەبیست دڵم وا لێدەدا گوایە خەلسەیەکی ئاینیم روو تێدەکا"، بەڵام مەسەلەکان لێرەدا کۆتاییان پێنایەت بەڵکو لە یادەوەرییەکدا کە زاناکانی سەردەمی کلاسیك باسی لێدەکەن، ئالکیبیادیس دەیگێڕێتەوە جارێکیان چۆن هەوڵیداوە سوقرات لە فەلسەفە دوور بخاتەوە. سەرەتا دانیشتنێکی تایبەتی یەك رۆژەی دروست کردو سوقرات هات بەو ئومێدەی کە ئاراستەی قسەکان بەرەو مەسەلەی خۆشەویستی بەرێت، بەڵام سوقرات لەم دانیشتنەدا دەستی لە فەلسەفە هەڵنەگرت. جارێکی تر ئالکیبیادیس، سوقراتی بۆ یاریگایەکی وەرزشی دەعوەت کرد بۆ

راهێنـانی وەرزشـی کـە لـەو سـەردەمەدا نـەریت وابـوو چـالاکییە وەرزشـیەکان بـە جەسـتەی رووت ئـەنجام بـدرێتو ئـەمجارەیان ئالکیبیادیس هەلەکەی بە باش زانیو وای بە باش زانی زۆرانـی لەگەڵ بگرێـت، پێکـەوە دەسـتیان بـە زۆرانبـازی کـرد، بـەلام نـەیتوانی لـە فەلسەفەی دوور بخاتـەوە. جـارێکی تـر هەوڵیـدا سـوقرات بـۆ ماڵـەوە دەعـوەت بکـاتو مـەی بخۆنـەوە، بـەلام سـوقرات مـەیی نـەخواردەوەو ئالکیبیادیس سەرنەکەوت. ((زۆرجار شەرابی دەخواردەوە، بـەلام کـەس نەبوو بە مەبەستی سەرخۆشی سەرخۆشی بکات)). سەرەڕای ئەمانـەش ئەو دانیشتنە ئەوەندەی خایاند کە سوقرات ناچار بـوو شـەو لـە مـاڵی ئالکیبیادیس بمێنێتەوە. پاشان بەوشـێوە درێـژەی پێـدا:" دەرەنجـام لـە سـەر ئـەو تەختـەی کـە نـانی شـەومان خواردبـووەوە خـەوی لێکـەوتو ئێمە تەنها بووین"، ئالکیبیادیس کە کوڕێکی جوانو لووسـکەڵە بـووەو ویـستوویەتی سـوقرات لـە خـشتە بـەرێت خـۆی بـۆ لای سـوقرات دەخشێنێتو قوڵ لە قۆڵی دەکا بەلام سوقرات دوور دەگرێتو ئـەویش ناچار دەبێت وەك برا چاو لە سوقرات بکاتو پاشان دەخەوێت". لەو سـەردەمەدا خۆڕاگرییەکـەی سـوقرات لـە چـاو خەڵکـدا بەوپـەڕی خـۆڕاگری دادەنرێـت کـە خـەڵك لـەو کارانـەدا قـووڵ ببوونـەوە، بـەلام سوقرات فەلسەفەی بەلاوە شیرین بوو تا ئەو کارانە.

سـوقرات کەسـێکی ریـازەت کـێش نـەبوو، نـە رواڵـەتو نـە مێـژوو نـە روخساری هـیچ کامـەیان شایەتحاڵی ئـەوە نـین کە سوقرات گۆشـەگیر بووبێـت سـەرەڕای ئەمـەش ژیـانێکی دژواری تێپـەڕ کـرد. بـە هـۆی

کارکردن دوورەپەرێز بوو بەردەوام قەرزار بوو. لە بەرامبەر ئەوەشدا پێداگر بوو بۆ سەلماندنی ئەوەی کە خەڵکی ئەسینا هوشیار نین. تا رادەیەك میراتی باوکی پێگەیشتبوو و هاوڕا باشەکانی بە باشی ئاگایان لێبوو و هەندێجار میوانی سەر خوانی ئەوانە دەبوو. لەم میوانیانەدا وادیاربوو کە سوقرات میوانێکی خۆشەویست بووبێت چونکە تا بەیانی دەیتوانی نەخەوێت و قسە بکات و لە هەمان کاتدا زیاتر لە هەمووان بخواتەوە. لەم جۆر میوانیانەدا هەندێ کچ بۆ رازاندنەوەی خوان و خزمەتکردنی میوانەکان دەهاتن. سوقرات لەم میوانیانەدا تەنها خۆراك و شەرابی دەست دەکەوت.

بە پێ قسەکانی "دیۆگنیس لارتیۆس" سوقرات بەشێك لە کاتی خۆی بۆ کۆبوونەوەی نافەرمی لەگەڵ گەنجەکان تەرخان دەکرد. ئەم کۆبوونەوانە لە دوکانێکی پینەچیەتی هاوڕێیەکەیان دا بە ناوی سیمۆن لە سنوری ئاگۆرا بەڕێوە دەچوو. ئەمڕۆکەش لە لێواری ئاگۆرا بەردێکی هەڵکەندراوی هوروس لە سەر دیواری ماڵێکی کۆن دەبینرێت کە لە سەری نووسراوە:" من بەردی سنوری ئاگۆرام". لەم دواییانە بە هۆی کۆڵینەوەی ئاسەوارناسەکان لەم شوێنەدا رێژەیەکی زۆر پاژنەکێش و قاپێکی بچوك تایبەت بە سەدەی پێنجەمی پێش زایین دۆزراوەتەوە کە لە سەر قاپێکیان ناوی سیمۆنی لە سەر نووسرابوو. ئەو شتانەی دۆزرابوونەوە هەمان ئەو دوکانە بوو کە سوقرات وانەی فەلسەفی تیا دەوتەوە.

چەند ساڵ لەوەوپێش کە من لە ئەسینادا بووم ئەم شوێنەم بینیو لەگەڵ سەربوردەی سوقرات پێوانەم کرد. رووبەری دوکانەکە تەنها چوار هەنگاوی دووجا بوو. بێگومان دەبوایە دۆخێکی قەرەباڵغ بووبێت لەگەڵ دەنگی چەکوشەکەی سیمۆن بە سەر سندانەکەو دەنگە دەنگی ئەو مشتەریانەی کە دەهاتنو دەڕۆیشتن هەڵبەت قسە سەیرو سەمەرەکانی سوقرات بە گوێیان دا دەهات. دۆخی پێویست بۆ بارودۆخێکی وا پێویستی بە تەرکیزو خێراتێگەیشتنو توانایی بۆ پاراستنی بەردەوامی زانیاریەکان بوو کە دەبوا گوێگرەکان هەوڵیان بۆ بدایە. سوقرات کارامەیی ئەکتەرێکی هەبوو چونکە بە بەردەوامی نمایشەکەی بە باشی بەڕێوە دەبرد. بۆیە دەکرێ ئەوە بە باشترینو گەورەترین رۆلگێڕی فەلسەفە ناو بەرین.

بەڵام لە راستیدا سوقرات لەم وانانەیدا چ ئەزموونێکی وەردەگرت؟ یەکێ لە قسە نەمرەکانی ئەمە بوو:" ئەو ژیانەی کە پابەند نەبێت بە شیکردنەوەو لێکۆڵینەوە، بەهای مانەوەی نیە". ئەم قسەیە تا رادەیەکی زۆر دەربڕی دۆخی رۆشنبیرانەو بەهرەمەندییە لە بیرێکی ئاسوودە. بە هۆی هەندێ پلەی سەربەخۆیی تاکەکەسی کە سەرچاوەی لە دیموکراسیو ئاسوودەییو باوبوونی کۆیلایەتی، دەوڵەت شارەکانی یۆنان یەکەم کۆمەڵ بوون تیایاندا چینی رۆشنبیر دەرکەوت. لەمڕووەوە یۆنانیەکان بۆ بەدواداچوونی بیروباوەڕ و کارەکانیان دەرفەتی باشیان بە دەست هێنا. گوایە بێکاریو ئاسوودەیی لەش بنەمای دەرکەوتنی

هەر بیرکردنەوەیەکی نوێیەو ئەمەش هەر ئەو راستیەیە کۆمەڵی جدیو زەحمەتکێشی مامناوەندی کۆمەڵگە لێی دوور و غافڵن.

سوقرات بڕوای وابوو خودی راستەقینەی هەر کەسێك هەمان ورەیە. فەیلەسوفەکان پێش سوقرات وتبوویان رۆح هەمان ناوەڕۆکی ژیانی هەتاهەتاییە کە لە ناخماندایە. ئەوانە بڕوایان وابوو کاتێك جەستە چالاکە رۆح خەوی لێدەکەوێو کاتێك جەستە خەوی لێدەکەوێ رۆح هوشیارە." جۆرێك ئەستی ئەمر هاوشێوەی بیرۆکەی یۆنگ لەم سەردەمەدا نیە. لە روانگەی سوقرات رۆح زیاتر هاوشێوەی شتێکە وەك کەسایەتی ئەست، هەر ئەو شتەی کە دادوەری لە سەر دەکرێت کە هوشیارە یان نەزان، باشە یان خراپ. بە واتایەکی تر هەر ئەو شتە کە لە بواری ئەخلاقیەوە لێی بەرپرسیارین. بڕوای وابوو دەبێ هەوڵبدرێت ورەمان هەرچەند باشتر بێت هاوشێوەی خوای لێدێت.

بەڵام بۆچی؟ سوقرات دەیوت هەموو کەس بە دوای بەختەوەرین، بەڵام ئەگەر پێی ناگەن گرێدراوی ورەییان نیە. هۆکاری ئەوەی هەندێ کەس باش نین ئەوەیە ئەم کەسانە سەرنجیان بۆ لای شتێك راکێشراوە کە بەلایانەوە باش بووە، بەڵام لە راستیدا باش نەبووە. ئەگەر لە راستیدا بمانزانیبا چی باشە ئێستا دۆخو نەریتێکی باشمان هەبوو و ناکۆکیو دژبەرەکی ناخمانو کۆمەڵگەکانمان نەدەما. هەڵبەت رەنگە تەنها فەیلەسوفێك دەتوانێ ئەوەندە سادە بێت کە ئەم پاساو لێکدانەوەیە باوەڕ بکات. باشتر وایە بڵێین هەمووومان تێگەیشتنێکی نادیارو بێ ئەزموونمان هەیە بەرامبەر بە واتای چاك یان باش، بەڵام

کاتێـك دەست دەکـەین بـە جێبـەجێ کـردن و کەمکردنـەوەی لـە بـواری پراکتیکی لەم دۆخەدایە کە ناکۆکیەکان بـریتین لـە تاکەکەسـی یـان لـە کۆمەڵگـە سـەرهەڵدێنێت. ئایـا باشـە کاتـەکانمان بـۆ فەلـسەفە تـەرخان بکەین؟ ئایا باشە ژنەکان لە ماف دەنگدان بێبەش بکەین؟

یۆنانیەکان لە دەوڵەت شاری بچوکدا دەژیـان و هـەر ئـەم دەستکەوتەش کۆبوونـەوەی گـشتی بـۆ سـاز دەکـردن. لـەم دەورانـەدا کـە ئەسـینا بەهێزترین دەوڵەت شاری یۆنان بوو تەنها (٤٢) هەزار پیاوی ئازادی لـە خـۆ گرتبـوو. یۆنانیـەکان بڕوایـەکی پتـەویان بـە میانـەڕەوی هـەبوو. (دروشمێکی گـەورەتریان هـەبووە کـە لـە پەرسـتشگەی دلفـی لـە سـەر بەردێك هەڵکەندرابوو دەڵێت: "زێـدەڕۆیی لـە هـیچ شـتێك دا". وادیـارە بۆچوونی سـوقرات سـەبارەت بـە چاکە بـە گشتی بەرهـەمی بـارودۆخ و سەردەمی خۆی بوو. لەم سەردەمەدا دانیشتوانی ئەسینا لە ژن و پیاو و منـداڵ و ئـازادو کۆیلـەو بێگانـە نزیکـەی (٣٥٠) هـەزار کـەس بـووە. زۆربەی خەڵك کـە لـەم شـارەدا بێبـەش بـوون لـە مـاف کۆمەڵایـەتی لـە راسـتیدا بڕوایـان وابـوو ئـەم بەختـە خراپـە بـە هـۆی رۆحـی خراپـی ئەوانە.

سـوقرات لـە تەمـەنی (٥٠) سـاڵیدا لەگـەڵ گزانتیـپ هاوسـەرگیری کـرد. مێـژوو روخـسارێکی ناشـیرینی لـە گزانتیـپ پیـشان داوە، بـەڵام ئاگامـان لەوەش بێت ژیان کـردن لەگـەڵ سـوقرات کـارێکی ئاسـان نـەبووە. وابیر بکەنەوە کەسێك سـەرلەبەیانی تـا ئێـوارە لـە کـۆڵان و بـازاڕدا خـەریك

باس‌و موناقشەیەو دینارێك کاسبی ناکات‌و هەموو شەوێك بە سەرخۆشی دێتەوە ماڵەوەو دراوسێکان گاڵتەی پێدەکەن.
گزانتیپ تەنها کەسێك بوو کە دەیتوانی لە باسی فەلسەفی دا پێشبڕکێ بکات. سەرەڕای ئەمانەش ئەگەر هاوسەرێتیەکی ناخۆش رووی دابێت ئەم دوانە زۆر گرێداروی یەکتر بوون. گزانتیپ سێ منداڵی لە سوقرات ببوو کە هیچ کامەیان باس‌و بابەتێکی باشیان لە باوکیان فێر نەبوون ( بە پێی مێژوو هەموویان ژیانێکی ئاساییان هەبووە). گزانتیپ سەرەڕای گلەیی‌و نارەزایەتی بەرامبەر بە مێردەکەی ئاگاداری ئەوەش بوو هاوسەری ژیانی مرۆڤێکی دەگمەن‌و سەیرە، بۆیە لە کاتی پێویستدا بە سەقامگیری و پتەوی پشتی مێردەکەی دەگرت‌و لە پاڵی دەوەستاو لە کاتی مردنەکەیدا خەمێکی زۆر ناخی گرتەوە.
کاتێك سوقرات تەمەنی (٦٥) ساڵان بوو شەڕی پلوپونۆزی بە خەمێکی گەورە بۆ ئەسینایەکان تووشی شکست هاتن. لیساندەر رێبەری سەرکەوتووی ئەسپارت لە ئاراستەی پێکهاتنی حکومەتی دەست نیشانکراوی لە ئەسینا بەرەو پیرایۆس بەڕێکەوت‌و حکومەتی "سی جەبار"ی پێکهێنا. بەمجۆرە سەردەمێك لە حکومەتی وەحشی دەستی پێکرد کە تیایدا سیاسییە ناکۆکەکان لەگەڵ نەختێ گوماندا دەست بە سەر دەکران‌و پاشان دادگایی دەبوون‌و سزا دەدران‌و لەگەڵ ئەوەش ماڵ‌و داراییەکانیان زەوت دەکرا. لەم کاتەدا زۆربەی بڕواداران بە دیموکراسی لە ئەسینا هەلاتن، بەلام سوقرات مایەوە. سوقرات سەرەڕای تاك گەراییەك کە هەیبوو لەوبارەیەوە شێلگیر بوو، بەلام

لاینگری لە دیموکراسی نەدەکرد. لەو سەردەمەدا دیموکراسی بە واتای جۆرێك لە حکومەت هێشتا دەورانی منداڵێتی خۆی تێپەڕ دەکاتو دەرەنجام زەمینەی دروست دەکرد بۆ نەگەیشتن بە ئاستی پێویست لە لایەكو لە لایەکی تر زێدەڕۆیی لە ئارادا بوو. لە ئەسینای سەردەمی دیموکراسی تەنانەت فەرماندەکانی سوپاش بە دەنگی خەڵك هەڵدەبژێردران تەنانەت بە گوێرەی شێوازەکانی ئەمڕۆ لە تاکتیکی فەرماندەییو ئەفسەری لاوازتر بوون. دوا بە دوای شکستهێنانی ئەسینا لە شەڕێکدا دیموکراتەکان لۆمە کران، بەڵام سوقرات بە پێی بیرۆکەی ئەخلاقی لە روانگەی فەلسەفی دژی دیموکراسی رادەوەستا. سوقرات دەیوت زۆربەی  خەڵك بە هۆی نەبوونی هوشیارییەکی باشو دەست نیشان نەکردن تووشی ئازارو بەدبەختی دەبنەوە. لەوڕووەوە ئەگەری هەیە رێبەرانی سیاسی بەرەو دەسەڵات دەبەن کە خۆیان بۆچوونێکی ناڕاستیان هەیە لە بەرامبەر چاکەدا کەواتە راستەوخۆ بەرپرسیارن. بڕوای وابوو تەنها دوایین چاکە فەلسەفەکەی ئەوە کە خەڵك لەو رێگایەوە لە شتەکان تێدەگەن، بۆیە ئەوی بەرەو کاری مەترسیدار دەبرد. پاشان کاتێك ئەفلاتوون ئەم بۆچوونەی لە کتێبەکەی خۆی بە ناوی "کۆماری" بڵاو کردەوە، ئەو کۆمەڵگە ئامانجدارەی لە تیایدا کتێبەکەی وێنا کردبوو ببووە کابۆسێکی تەواو. رێك وەك سوقراتو ئەفلاتوون، نازییەکانو دەسەڵاتدارانی یەکێتی سۆڤیەت بڕوای بە چاکەیەکی تەواو هەبوو کە تەنها لە رێگای فەلسەفەی خۆیانەوە بە

دەست دەهات هەڵبەت مێژوو شایەتحاڵی ئەوە بوو کە چ قەیرانێکیان دروست کرد.

یەکێك لە رێبەرەکانی "سی جەبار" (کریتیاس" بوو کە خۆی یەکێ بوو لە قوتابیە پێشووەکانی سوقرات. بەڵام کریتیاس لە سەرەتای گەیشتنی بۆ دەسەڵات بە راشکاوی روونی کردەوە هەموو ئینکارییەکانی سەردەمی گەنجێتیی تێپەڕ کردووە. مەبەستی ئەوە نەبوو سوقراتی لە بیر کردووە بەڵکو تەنانەت زیاتر لەوەش سەلماندی کە وانەوتنەوەی فەلسەفە لە شەقامەکانی ئەسینادا قەدەغەیەو لەم بوارەدا باسی سوقراتی گێڕاوەتەوە. کریتیاس بە باشی تێدەگەیشت ئەم مامۆستا بەساڵاچووە بە چ شێوازێك دەتوانێ واتای وشەکان بۆ سوودی خۆی لێکبداتەوەو بە هیچ شێوەیەك تاقەتی ئینکارییەکی وای نەبوو. بۆیە هەر جۆرە چالاکییەکی سوقرات جیا لەوەی ناوی فەلسەفەی لە سەری دادەنێت یان هەر شتێکی تر بە راشکاوی قەدەغە کرا.

هەندێ کەس بڕوایان وایە بڕیاری سوقرات بۆ مانەوەی لە ئەسینا کە زاڵمەکان لەوێ دەسەڵاتدار بوون کارێك بوو بەرەنگاربوونەوە، بەڵام راستیەکە ئەوەیە بە راشکاوی روون کرایەوە هەرگیز مەبەستی ئەوە نیە بەشداری لە سیاسەت بکات بەڵکو شێلگیرانە دەیەوێ وەك کەسێك لە سەر بنەما رابوەستێت.

سەرەڕای ئەمانەش سەدەی پێنجەمی پ. ز بە دژواری دەگرا لە کێشەکانی سیاسەت دوور بکەویتەوە، تەنها بە شێوەیەك دەگرا کە ژن یان کۆیلە بوایای. زاڵمەکان بە گشتی بەرامبەر بە تەنهایی خۆیان لە

ناو حکومەت دا ئاگادار بوونو زۆر پیان خۆش بوو گروپێکی زۆر لە خەڵك تێکەڵی سیاسەتەکانیان بکەنو بۆیە لەم رێگایەوە شەریکی تاوان بۆ خۆیان بدۆزنەوە. دەرەنجام سوقرات لەگەڵ چوار کەسی تردا لە لایەن زاڵمەکانەوە بۆ جێبەجێ کردنی کارێکی سیاسی بانگهێشت کران. راسپاردەکەی سوقرات ئەوە بوو بڕوات بۆ دوورگەی سالامیس بۆ دەست بە سەر کردنی لیۆن سەرۆکی دیموکراتەکان کە لە گەڵ حکومەتدا ناکۆك بوون. ئەم دەست بە سەر کردنە نایاسایی بوو گومانیشی تیا نەبوو لەگەڵ گەڕانەوەی لیۆن بۆ ئەسینا دەکوژرا. سوقرات بە بێ ئەوە بیر لە دەرەنجامی کارەکە بکاتەوە گوێ بەو راسپاردەیە نەداو بە دەستی بەتاڵ گەڕایەوە بۆ ئەسینا. کارێکی وا دەیتوانی گیانی بخاتە مەترسیەوە بەڵام بە دوای هەندێ ئاڵوگۆڕی لەناکاو کریتیاس کوژراو ماوەیەك پاش ئەوە زاڵمەکان لە ئەسینا دەرکران.

دیموکراتەکان بوونە جێگری زاڵمەکانو ئەوەش کارێکی سروشتی بوو کە ئەوانە مەبەستی تەمیە کردنی سوقراتیان هەبووبێت، بەڵام بۆ ئۆقرەگرتنی کێشەی شەڕە ناوخۆییەکان لێبوردنی گشتی دەکراو سوقرات لە مەترسی هەلات یان لانیکەم بەمجۆرە هاتە بەرچاو. لە ساڵی (٣٩٩)ی پ. ز سوقرات بە تاوانی کفرکردنو گەندەڵ کردنی گەنجەکان دەستگیر کرا. روخساری سەرەکی پشت ئەم تاوانانە کەسایەتی دیموکراتخوازی بەناوبانگ "ئەنتینۆس" بوو کە دوژمنایەتیەکی دوور و درێژی بەرامبەر بە سوقرات هەبوو. چەند ساڵ پێش ئەمە کوڕەکەی ئەنتینۆس قوتابیی سوقرات بوو و سوقرات

هانیدابوو دەست بەربدا لە ئەزموونی رەنگ کردنی خوری کە پیشەی بنەماڵەییان بوو لە بری ئەوەش رووبکاتە ژیانو وانەی فەلسەفە.
ئەو تاوانانەی خرانە پاڵ سوقرات بە تەواوی ناراست بوو، بەلام بەپێچەوانەی ئەو مەسەلانە ئەو سزایەی بۆ سوقرات برابووەوە لەسێدارەدان بوو کە لە راستیدا سزایەکی زێدەرۆیی بوو. ئایا پیاوەپیرێکی تەمەن (٧٠) ساڵ تەنها لە بەر ئەم تاوانە دەبێ لە سێدارە بدرێت؟ لەبارەی ئەم نامە تاوانبارکەرانەو ئەو بابەتانەی بە دوای ئەوانەدا هاتووە، ئایا نهێنیەك هەبوو کە نەدۆزرێنەوە؟ بۆیە وتم "نهێنی"و نەموت "شتە نادیارەکان" چونکە لە ئەسینای ئەو سەردەمەدا بە رواڵەت هەموو خەڵك دەیزانی مەسەلەکان روویان لە کام لایە.
دەرەنجام سوقرات لە بەردەم (٥٠٠) کەسی ئەندامی شۆرای رێبەرایەتی ئەسینا راوەستا. هەموو ئەم ئەندامانە بە پشك خستنی لە نێو پیاوانی ئەسینادا هەڵبژێردرابوون. دادوەرەکە "ملتۆس" بوو کە لە راستیدا لە ناوچەی ئانیتۆس بوو. ئەوە تراژیدیای دەهۆنیەوەو کەسێکی ناسەرکەوتوو بوو بە قژی درێژو ریشی تەسكو لووتی نوك تیژ کە بە زمانی چزدارییەوە رکەبەرێکی باش بوو لە بەرامبەر سوقراتدا.
ملتۆس دادنامەکەی دژی سوقراتی بە داواکاری سزای لەسێدارەدان کۆتایی پێهێنا. پاشان نۆرەی تاوانبارکراوەکە بوو بەرگری لە خۆی بکات، وادیار بوو سوقرات لەبارەی سووربوونی دادگا لە سەر سزاکە

تووشی خراپ تێگەیشتن بوو لەگەڵ ئەوەش بە جۆرێك هەڵسوکەوتی دەکرد کە گوایە لە وانەیەکی باسی فەلسەفیدا بەشداری کردووە.
هەندێ لە ئەندامانی دادگا لەمشێوە رووبەڕوو بوونەوەی سوقرات خەنی ببوون، بەڵام بەلای زۆربەیانەوە ناخۆش بوو. لە کۆتاییدا دادگا بە (٢٨٠) دەنگ لە بەرامبەر (٢٢٠) دەنگی ناکۆك سزای لەسێدارەدانی بۆ سوقرات بڕیەوە. سەرەی سوقرات بوو بەرامبەر بە سزا نارەزایەتی دەربڕێت، بەڵام بەردەوام وایدەزانی دادگا خەریکە بە شێوەیەك گاڵتەی لەگەڵ دەکات و بە باشی دەیزانی ئەو سزایەی بەرامبەری دراوە زۆر گاڵتەجارییە. لە بەرامبەر سزای لەسێدارەکەیدا پێشنیاری کرد لە بری ئەوە چونکە خزمەتی شارەکەی کردووە رێزی لێبگیردرێت و بۆ ئەم مەبەستەش لە "پریتانیۆم" کە هۆڵێکی پیرۆز بوو و قارەمانەکان لەوێ لە سەر خەرجی گشتی پێکەیەکیان پێدەدرێت و پلەو پایەو رێزیان لێدەگیردرێت شوێنێکی بۆ دابین بکەن. بەم قسانەی سوقرات چپەو هەراو هوورا لە ناو دادگا بڵاو بووەوە. سوقرات کە بینی دادگا توورە بووە زیاتر لە سەر داواکەی و مەسەلان سوور بووەوەو پێشنیاری کرد لە باتی لەسێدارەدانەکەی بڕێکی پارەی سزا بۆ تەرخان بکرێت کە بتوانێ بیدات. برە پارە پێشنیارەکەی سوقرات بەردێکی مینا بوو کە نرخی بە قەد یەك گۆزەڵە شەراب بوو. دیسانەوە هەراوهوورا لە نێو داداگا بڵاو بووەوە. هاورێکانی سوقرات لێی دەپاڕانەوە کە بەرامبەر بە دادگا گاڵتە نەکات و سوور بێت لە سەر مەسەلەکان. پاشان لە وەڵامی هاورێکانی دا وتی دە یا سی بەردی مینا بێت، بەڵام ئیتر دادگا بە هۆی

قسەکانی سوقرات سەبرو مواری لێبڕاو ئەمجارەیان سزادانی لەسێدارەدان بە (٣٦٠) دەنگی هاوڕا لە بەرامبەر (١٤٠) دەنگی ناکۆك پەسەند کرا.

لەم مەسەلەیەدا ئەو جووڵانەی لە هەڵسوکەوتی سوقرات دەبینرا لە سەرووی ئینکاریەوە بوو. ئایا لە راستیدا پێی وابوو دادگا قەدر و ڕێزی لێدەگرێت‌و ئازادی دەکات؟! یان خۆ بڕیاری دابوو بمرێت؟ ئەگەر لە بری لەسێدارەدان داوای بەرەو تاراوگە ناردنی بکردبا لە دادگا، بە دڵنیاییەوە پەسەندیان دەکردو ئەویش بە هاوڕایی ئەو هاوڕێیانەی کە ناسراو بوون دەیتوانی بە ئاسوودەیی لە تاراوگەدا بژیت.

قەرار وابوو سزاکەی سوقرات پاش دادگایی کردن بەخێرایی جێبەجێی بکەن، بەڵام رۆژێك پێش دەسپێکی دادگاییەکە لە سەر نەریتی ساڵانەی کەشتیی پیرۆز گەشتێکی بۆ دوورگەی (دلۆس) بە ماوەی زیاتر لە (١٠٠) کیلۆمەتر لە دەریای سپی دا بڕیبوو نەریت وابوو تا پێش گەڕانەوەی ئەو کەشتیە هیچ سزایەکی لەسێدارەدان جێبەجێ نەدەبوو. وابوو کە سوقرات لە زیندانی حکومی ئەسینادا دەست بە سەر کرا.

پاشماوەی ئەم زیندانە هێشتا لە (١٠٠) کیلۆمەتری باشووری رۆژئاوای شوێنە کاولەکانی ئاگۆرا دەبینرێت و کەوتووەتە نێوان زەوییەکی ناڕێك و پڕ لە بەردەڵان‌و بنە کۆڵەکەی کۆن. ئەو ژووورە تاکەکەسییە کە پەنا بوو و سوقراتی تیا دەست بە سەر بوو رێك لە لای راستی ڕاڕەوی زیندانەکەیەو لێرەدا بوو سوقرات لە دوایین رۆژەکانی ژیانیدا

هاوڕێکانی سەردانیان دەکرد. لەم پارچە زەوییە ناگرنگە کە ڕووبەرەکەی (٦) هەنگاو بۆ (٦) هەنگاو بوو هەندێ لەختە ڕوویدا کە ئەفلاتوون لە چوارچێوەی جوانترین قسەکانی دا هێناویەتەوەو بە شاکاری ئەدەبیاتی یۆنان دادەنرێت و شیاوی پێوانەکردنە لەگەڵ بەرهەمەکانی هۆمەرو تراژیدیا.

لە گشت کاتێکی ئەم قسەکانەدا قارەمانەکە سوقراتەو وەك خۆی دەمێنێتەوە لەگەڵ تایبەتمەندییە مرۆڤانەکانی، عاقڵ و زۆر هاندەر بەو جۆرەی کە دەکرێ وێنا بکرێت. لە لەختەیەك لەم قسانەدا هاوڕێکەی بە ناوی (کریتۆن) دەڵێت نەخشەیەکی بۆ هەلاتنی لە زیندان داڕشتووەو بەرتیلی داوەتە هەموو زیندانیەکان تا دەرفەتی بۆ بڕەخسێنن هەڵبێت، بەڵام سوقرات قبوڵی ناکات. لەوڕووەوە کارێکی وا پێچەوانەی هەموو ئەو شتانەیە کە لە پێناویدا هەوڵی داوە. سوقرات باوەڕێکی پتەوی بە یاسا هەبووە تەنانەت کاتێك یاسا بە هەڵەدا چووبێت.

دەرەنجام ئاگادار دەبنەوە کەشتیە پیرۆزەکە نزیك تەنگەی (لونیۆن) بووەتەوەو بینراوەو بەمزوانە دەگاتە ئەسینا. هاوڕێکانی سوقرات و گزانتیپ ـ ی هاوسەری لە ژووری تاکەکەسیەکەیدا کۆ دەبنەوە پاشان بۆ دووڕپەرێز بوون لە دۆخێکی هەستیاربوون ئیزنی گزانتیپ دەدات. گزانتیپ لە کاتی چوونە دەرەوە لە بەردەم ژوورە تاکەکەسیەکەی سوقرات پێی دەڵێت ئاخۆ تۆ بێتاوانی. ئنجا سوقرات بە شێوازی

سەیروسەمەرەی خۆی وەڵامی دەداتەوە: ئایا وات بە باش دادەنا تاوانبار بوایام؟

ئنجا سوقرات باسی مردنو نەمری بۆ هاوڕێکانی دەخاتەڕوو. سەرەڕای ئەوەی ئەفلاتوون بە هۆی نەخۆشی لەم رۆژەدا ئامادە نەبوو، بەڵام هەموو وردەکارییەکان کە بۆی دەگێڕنەوە بە شێوەیەکی خەفەتاوی دەگێڕێتەوە.

دەرەنجام قاپێك کە ژەهری تێدایە دەدرێتە دەستی سوقرات تا بیخواتەوە (خەڵکی ئەسینا بەمشێوەیە سزای لە سێدارەدانیان جێبەجێ دەکرد). سوقرات کە تا دوایین ساتەکانی تەمەنی دەستی لە توانج بەرنەدابوو لە کەسی راسپاردەی جێبەجێکەری لەسێدارەدان پرسی:" باشترین رێگای جێبەجێ کردنی ئەم کارە چییە؟" ئەو کەسە وەڵام دەداتەوە:" ئەوە بخۆرەوە پاشان هەستە پیاسە بکە با تۆزێ سەرت قورس بێت ئنجا راکشە، ژەهرەکە بۆ خۆی کاری خۆی جێبەجێ دەکات." دیسانەوە سوقرات پرسیاری لێدەکات:" ئایا دەتوانم قومێك لەو ژەهرە بۆ خواوەندەکان بکەمە سەر زەوییەکەدا؟" ئنجا وەڵامی دەدرێتەوە: "نا، تەنانەت نەختێکی لێ بەفیڕۆ مەدە چونکە بە باشی کاریگەر نابێت". پاشان سوقرات بە یەکجار ژەهرەکە دەخواتەوە. ئیتر هاوڕێکانی ناتوانن خەمی گەورەی خۆیان بشارنەوەو هەموویان دەست بە گریان دەکەن. سوقرات پیان دەڵێت "خۆتان کۆ بکەنەوەو بڕۆنەوە. من لە بەر ئەوە گزانتیپ- م روانە کرد کە دیمەنی وا نەبینم." سوقرات رادەکشێتو وردە وردە سستیو قورسایی لە پێ‌کانیەوە بەرەو

سەرەوە تەشەنە دەکات. "کریتۆن لە بیرت بێ من کەڵەشێرێك قەرزاری ئاسکەلپیۆس- م." ئەمە دوایین وتەی سوقرات بوو.

لەم دوایین وشانەی سوقرات کە بە پێی گێڕانەوەکانی ئەفلاتوون بە دەستمان گەیشتووە رەنگدانەوەی رەسەنایەتی لە سوقرات دا هەستی پێدەکرێت. نەك لە بەر ئەوەی کە مەبەستی ئەو قسەیە بە وردی روون و راشکاو نیە. لەم وتارانە ئەوە دەست دەکەوێ دەتوانین دڵنیا ببینەوە کە راستی و حەقیقەت بە سەر چیرۆك و ئەفسانەدا زاڵە تەنانەت سەرەڕای ئەوەش کە ئەفلاتوون ناچارە. دوایین رۆژەکان لە زاری هاوڕێکانیەوە دەگێڕێتەوە.

دوایین وشەکانی سوقرات زۆر لێکدانەوەی بۆ کراوە. لە هەمووی ساکارتر ئەوەیە سوقرات کەڵەشێرێك قەرزداری هاوڕێیەکی بووە بە ناوی (ئاسکەلپیۆس) و دەیەوێت قەرزەکەی بدرێتەوە و لە سەری نەمێنێت، بەڵام لە روانگەی توێژەرانەوە ئەم لێکدانەوەیە لە رادە بەدەر بیرتەسکانەیە. دەبێ بزانین ئاسکەلپیۆس جیا لەوەی ناوبانگی زۆری هەبووە، ناوی خواوەندی پزیشکی و شەفای لە سەر دانراوە. هەر ئەو پیاوە کە داردەستێکی بە دەستەوەیە و مارێك بە دەور داردەستەکەیدا ئاڵاوە- ئەمەش هێمای باوی پزیشکیە کە لە سەر دەرمانخانەکان و ئەمبوڵانسەکان (ئیسعاف) نەخش دەبێت. هەندێ کەس دەڵێن دوایین وتەکانی سوقرات توانجێك بووە بۆ دانی پسوڵەی خەرج و مەسرەفی پزیشکیەکەی. هەندێ کەسی تر لێکدانەوەی متافیزیایی هوشیارانەتریان خستووەتەڕوو. لەمڕووەوە دەکرێ بە

شێوەیەکی تر لێکبدرێتەوە:" کریتۆن دەبێ ئێمە کەڵەشێرێك بۆ ئاسکەلپیۆس قوربانی بکەین – ئەم کارە لە بیر مەکەو جێبەجێی بکە." خواوەندی پزیشکی واتە ئاسکەلپیۆس ئەو توانایەی هەبووە رۆحەکان ئامادە بکات بۆ لێبوردنی ئاخۆشیەکانی دنیا کە بە حساب بۆ دنیایەکی تر دەڕۆن. لەم روانگەیەوە بووە کە قوربانی ناوبراو دەیتوانی ببێتە پردێك بۆ تێپەڕبوونی رۆحی سوقرات بۆ دنیای دوای مردن. سوقرات پێش خواردنەوەی ژەهرەکە بە هاورێکانی وت:" تەنها ئەو کەسانەی کە ژیانێکی بێهوودەیان بە سەر بردووە هیوایان هەیە مردن کۆتایی هەموو شتەکان بێت، ئەمەش بە سوودی کەسانێکی وایە کە وابیر دەکەنەوە، بەڵام من بڕوام وایە رۆحە خراپەکان لە جیهانی – فرۆدینی تارتارۆس- دا سەرگەردان دەبن و تەنها ئەوانەی ژیانیان بە شەرەفەوە تێپەڕاندووە لە جیهانی راستەقینەدا قبوڵ دەکرێن."

((بەڵام مەبەستی سوقرات لە جیهانی راستەقینە چیەو کامەیە ، ئەمە خۆی لە خۆیدا لێکدانەوەی دەوێت.))

سوقرات بە رادەی پێویست جوامێرو ئەخلاقی فەیلەسوفانەی هەبوو کە لەمبارەوە بەهرەیەك بەجێ بهێڵێت کە پێداگری لە سەر نەبێت، ئەوسا کە پێکی ژەهرەکەی دەخواردەوە بە هاوڕاکانی وت:" ئێستا رێگامان لێك جیا دەبێتەوە، من بەرەو مردن دەڕۆم و ئێوەش بەرەو ژیان. کام رێگا باشترە ئەوەیان کەس نازانێت."خەڵکی ئەسینا دوای چەند رۆژێك پاش مردنی سوقرات زۆر بە قورسی بە سەریاندا شکایەوە کە تووشی چ تاوانێك بوون بەرامبەر بە سوقرات. کاتێکیان

دەست نیشان کرد بۆ پرسەکەی سوقرات. یاریگاکانو هۆڵی شانۆ و خوێندنگەکان پشۆ دران. ملتۆس بە مردن سزا دراو ئانیتۆس خرایە تاراوگە. پاشان لیسیپۆس (Lysippus: گەورەترین پەیکەرەسازی یۆنانی دێرین لە سەدەی چوارەمی پ.ز) پەیکەرێکی بورۆنزی سوقراتی سازدا کە لە "جادەی پیرۆز" دانرا. ئەو شوێنە کە سەردەمانێك خەڵك بە بێکاری لەوێ سەرقاڵ بوون. گوایە بێکاریەکەی سوقراتیان وەك بێکاریەکەی خۆیان چاو لێدەکرد.

هەموو ئەمانە رێزلێنانێکی زۆر بە شانازی بوو لە لایەن خەڵکی ئەسیناوە، بەڵام لە روانگەی منەوە سوقرات سەربازێکی پیادە بوو لە گۆڕەپانی شەڕێکی قووڵی سیاسی. بە گشتی کاتێ سەیری ئەم یارییە مێژووییە دەگەین سوقراتمان بە لاوە سەرکەوتووە چونکە ئەگەر وانەبوایە ئێستا لەبارەیەوە نەماندەخوێندەوە.

پاشکۆ:

## کابۆسی سوقـــــرات

بە پێی دوو سەرچاوە ئاگامان لە سوقرات هەیە، یەکیان (ئـەفلاتوون)و ئـەویتر (گزنفـۆن) کـە هـەردووکیان لـە قوتابیـەکانی سـوقرات بـوون. ئەفلاتوون بووە فەیلەسوفـو کۆی بیروبۆچوونەکانی خـۆی لـە کۆمەڵە وتارێکدا دەربڕی کـە لـە زۆربەیانـدا سـوقرات لـەو بازنەیـەدا ئامادەیـە، بـەڵام گزنفـۆن پـەنای بـۆ سـەبازیگەری بـردو لـەم پیـشەیەدا ئەوەنـدە ناسەرکەوتوو بوو کە لە کۆتایی دا پەنای بردە بـەر نووسـین. یـەکێ لـە ناوبانـگ ترین بەرهەمەکانی گزنفۆن مموٚرابیلیا (Memorabilia)یە کە تیایدا باس لە سوقرات دەکات.

بەداخـــەوە ئـــەم دوو سەرچـــاوەیە دوو وێنـــای جیـــاوازی ســـوقرات دەخاتەڕوو کە جارجارێك هاوشێوەی یەکن. گزنفۆن بە گشتی کەسێکی موحافیزەکار بووەو بە هۆی ئەوەی مامۆستا پیرەکەی تاوانبـار کـرا بـە گەندەڵ کردنـی بیرو فکـری گەنجـەکان زۆر شـڵەژا. کاتێـك بـەرگری لـە سوقرات دەکات دەبیـنین کۆمـەڵێك لـە رووداوەکـان جۆرێـك دێتـە بـەر چاو کە ئـەو سـوقراتەی ئـەو دەیناسـێنێت بـە دژواری لـە فەیلەسوفێك

دەچێت. لە یەکێ لە قسەکانی گزنفۆن دا بە ناوی ئوکونومیکۆس (Oeconomicus) سوقرات بە شێوەی کەسایەتییەك دەردەکەوێ کە هەموو نیگەرانیەکانی باخ‌و باخەوانییە. لە ممۆرابیلیاکەی گزنفۆن دا زۆرجار بیروڕاکەی سوقرات بە رادەیەك نارەسەن‌و بێزارکەرن کە مرۆڤ سەری سوڕ دەمێنێت و سەرەڕای هەموو ئەمانەش بۆچی ئەم هەموو قسەو قسەلۆکەی بزواند. پیاوێکی وا نەدەبوا تاوانبار بکرێت بە هۆی بیروڕای گەندەڵ کردنی گەنجەکان‌و هەرگیز نەدەبوا فەیلەسوفێکی شیاو بێت.

رەنگە گزنفۆن بێ تواناتر لەوە بووە کە بە باشی لە بیروڕای سوقرات تێبگات، بەلام لە لایەکی تر رێ تێدەچێت بڵێن توانای ئەوەی نەبووە روخسارێکی خەیالاوی لە سوقرات بخاتەڕوو کە لە راستیدا سوقراتی راستەقینە وانەبووە. بۆیە زۆر کەس هەوڵدەدەن ئەو ڕوخسارەی گزنفۆن لە سوقراتی دەخاتەڕوو بە روخساری راستەقینەی سوقراتی مێژوویی بناسن. (برتراند راسێل) زۆر دژی وەها بیروڕایەکە بۆیە دەڵێت:" راپۆرتی کەسێکی گەمژە لە سەر کەسێکی نوخبەو هەڵکەوتوو هەرگیز شیاوی متمانە نیە چونکە نەستی (لاشعوری) ئەو قسانە کە لەو کەسە بیستوویەتی بە شێوەیەك کە خۆی لێی تێدەگات، دەیگێڕێتەوە."

بە پێچەوانەی گزنفۆن ئەو سوقراتەی کە ئەفلاتوون دەیخاتەڕوو ئەگەری هەیە لە رادە بەدەر هوشیارانە خرابێتەڕوو. ئەو سوقراتەی لە روانگەی ئەفلاتوونەوە دەخرێتەڕوو روخسارێکی کارای نەخشێنراوی

ئەدەبییە. کەسایەتییەکی هەڵکەوتوو، بەڵام بە گشتی بەرهەمی وێژەی کارامەکەیەتی کە دەیگێڕێتەوە، بەو جۆرەی ئەو ئەگەرە لە مێشکماندا وێنای دەکات، ئەوە کەسایەتی راستەقینەی سوقراتە. لەمڕووەوە زۆر دژوارە لە نێوان ئەو شتەی سوقراتی راستەقینە دەریبڕیوەو ئەو شتەی ئەفلاتوون لە زاری ئەو دەیگێڕێتەوە جیا بکرێتەوە. ئاگاداری ئەوەین ئەفلاتوون فەلسەفەکەی خۆی بە گشتی لە زاری سوقرات دەربڕیوە، بەڵام ئەوەش تا چ رادەیەکە، ئەوە لێی ئاگادار نین.

ئەو روخسارەی من لەم کتێبەدا لەبارەی سوقرات خستوومەتەڕوو بە کەڵك وەرگرتن لە هەر دووی ئەم سەرچاوانە بووە. لەو دوو هەڵوێستە کە ئەم دوو سەرچاوەیە جیاوازن لە یەك، دەکرێ بیرۆکەیەکی گشتی بۆ کەسایەتی لە بیرنەکراو و لە هەمان کاتدا بە دۆخێکی پێشبینی نەکراو دابنرێت. ئەمە هەمان کابۆسی هەڵاتووی ئەو پیاوەیە کە من هەوڵمداوە بیخەمە دڵەوە. هەموان لە سەر ئەو واتایەن سوقرات لە بواری کەسایەتیو لە بۆچوونەکانی دا دۆخی نادیاری هەبووە. رەنگە ئەمڕۆ کە تووشی سەرلێشێواوی فەلسەفی بووین لەبارەیەوە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دۆخە نادیارەکانی خودی سوقرات.

## میراتی سوقرات

میراتی سوقرات کارێکی نادیارە و (ڕەنگە بە ویستی خۆی ویستوویەتی ئەو کارە بکات). کاریگەری سوقرات لە سەر زەین و بڕوای ئەفلاتوون و لە سەر هەموو فەلسەفە تا ئەمڕۆ زۆر قووڵ بووە. میراتی فەلسەفەی یۆنان وەك ڕەوتێکی خۆراك شوپهێنراوە، وەك چۆن (سیر) دەکرێتە ناو خواردن ئیتر ناکرێ بۆن و تامەکەی لە خواردنەکە جیا بکرێتەوە، لە جیهانی فەلسەفەدا بۆن و تامی یۆنانی کۆن بەمجۆرە شوپهێنراوە.

دیالێکتیکی سوقرات ڕۆڵێکی دیاریکراوی هەبووە. شێوازی وتووێژی ئەفلاتوون بە دڵنیاییەوە شێوەی ئەدەبی وتووێژەکانی ئەفلاتوونی تەنیوەتەوە، بەڵام نابێ حاشا لەوە بکەین کە کاریگەری لە سەر فەلسەفە نەبووە. شێوازی سوقرات بۆ شیکاری مەسەلەکان بە کارهێنانی ژیری بوو لە فەلسەفەدا. شێوازی وابوو کە داوای لە کەسی بەرامبەری دەکرد کە لە فەلسەفەدا پێشبڕکێیان دەکرد مەسەلەکە بکاتەوە. هەندێ مەسەلە کە بریتین لە هەموو شتێك: هەر لە دادوەری سروشتییەوە بگرە هەتا شێوازی بوون بە فەرماندە. جیا لەوەی کە مەسەلەی بەرباس کارێکی گاڵتە یان زۆر شاز بووبێت بە یەك شێواز ڕووبەڕووی دەبوونەوە. بەمجۆرە بوو کە داهێنانی گەورەی دیالێکتیك

بە واتای ئامرازی شیاوی کەڵك وەرگرتن پەسەند کرا بۆ پێوانەکردنی هەر مەسەلەیەك. شێوازی سوقرات وابوو پاش ئەوەی لایەنی بەرامبەر وەسفێکی بۆ مەسەلەکە دەبینیەوە، هانیدەدا بە دوای لاوازیو کەموکۆڕییەکاندا بگەڕێت تا بە لێکدانەوەیەکی باشتر بگات. بەمجۆرە هەوڵیدەدا لە نموونەی بچوك بۆ نموونەی گشتیو دەرەنجام بگات بە راستیی گشتگیر.

ئەمجۆرە راستیو شێوازانەی سوقرات بۆ گەیشتن بەو شتانە بووە پێشەکییەك بۆ دەرکەوتنی زانستی مەنتق کە قەرار وابوو پاش سەدەیەك لە لایەن ئەرەستۆ قوتابیی ئەفلاتوون داهێنان بکرێتو دابین بکرێت. ئەرەستۆش تیۆری "نموونە"ی پەسەند کرد، بەڵام بە گوێرەی پێداویستیەکانی خۆی ئەوەی گۆڕی. لە راستیدا ئەوە ئەرەستۆ بوو کە بە رەنگدانەوەی ئەو رەوتەی کە سوقراتو ئەفلاتوون بە فەلسەفەیان دابوو دیسانەوە ناجێگربوونی راستیەکانیان لە فەلسەفەدا زیندوو کردەوە. ئەرەستۆ هەوڵیدا هەموو شتێك هەر لە ئەستێرەناسی بگرە تا رێزمان ناسیو لە زانست بگرە تا تاوان لە فەلسەفەدا گونجانی، بەڵام دەرەنجام زیاترین دەسکەوتی دارشتنی نەخشەی وڵاتی زانستی مرۆڤایەتی بوو. لەم بوارەدا دیسانەوە لە بری جەخت کردنەوە سەر ئەو زانستەی کە بە کەڵکی کارێك بێت، دیسانەوە جەختی لە سەر تیۆری کردەوە. دەرەنجام کاتێك رۆمیەکان بە سەر یۆناندا زاڵ بوون بەختی فەلسەفە بەرەو کەمی چوو بۆیە لە روانگەی ئەو، فەلسەفە بە کەڵکی هیچ نەدەهات.

پاش رووخانی ئەمپەراتۆریای رۆما سەردەمی تاریكو شارستانیەتی رەوتی ئاینی سەدەکانی ناوەڕاست دەستی پێکرد. فەلسەفە بە درێژایی ئەم سەردەمە لە دۆخێکی راوەستان مایەوە، وەك ئەوەی شووشەیەکمان لە بەر دەستدا بێتو هەواکەی ناوی بەتاڵ بکەینەوە کە مۆرکی ئاینی لە سەر بدرێت. لەم سەردەمەدا ئەو هێزە فکرییەی کە توانی گشتگیرترینو قووڵترین فەلسەفەی ئاینی مێژوو پێکبێنێت لە روانگەی داهێنانی تەکنیك تەنها تا رادەیەك چووە پێشەوە کە گوایە ئاسنی ملی حەیوانەکان جوانتر دروست دەکرا (تەنانەت بنەمای میکانیکی ئەم داهێنانە لە سەدەی سێ ی پ.ز لە لایەن ئەرەشمیدۆس بیرۆکەکەی دارێژابوو). کەنیسە سەرەکیەکانی (گوتیك) لە نێو شەقامەکانی نێوان ریزی ماڵە وێرانەکانو زێرابەکان دا خۆی بینیەوەو بۆ رووبەڕوو بوونەوە لە بەرامبەر گشتگیربوونی نەخۆشی تاعوون چارەسەرییەکیان لە بەردەستدا نەبوو جگە لەوەی پەنا بۆ خورافە بەرن.

هەموو ئەمانە خەتای سوقرات نەبوو، بەڵام ئەو کاریگەریەی بیرۆکەمان سەرچاوەی لە فەلسەفەوە وەریگرت بە شێوەیەکی گشتی بەرپرسی ئەم هەموو شتانە بوو. زانستی مرۆڤ لە رادە بەدەر قەرزداری سوقرات بوو. پیشانیداین چۆن کەڵك لە بیرکردنەوە وەربگرین، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هەر ئەو بوو سنورداری کردین لەو بوارەی کە لە چ کاتو ساتو شوێنێکدا کەڵك لە بیرکردنەوە وەربگرین. دەرەنجام زانستی مرۆڤ گرێدراوی خاڵێکی نادیار کرا و ئەم بۆشاییە بۆ

ماوەی سێ چوار سەردەمی دەسپێکی فەلسەفە تا سەردەمی ئێستا خۆی گرتووە.

نموونەیەك لەم خاڵە نادیار و لاوازە لە پەرچدانەوەی گشتگیری تاعوون دەبینرێت کە بە درێژایی ئەو ماوەیە نیوێك لە خەڵکی ئەوروپای سەدەی چواردەهەمی زاینی لەناو چوون. هەر لە سەرەتاوە بۆ هەموو خەڵك دەرکەوت ئەم نەخۆشیە دەگوازرێتەوە. سەرەڕای ئەوەش تێبینیە زانستیەکان کەوتە پەراوێزی مەسەلە ئاینیەکان. بۆچی؟ بۆیە ئەو مەنتقەی کە لە دیالێکتیکی سوقرات لە دایك ببوو خووی بەوە گرتبوو روبەڕوی مەسەلەی چەقبەستوو ببنەوە نەك مەسەلە ئەزموون کراوەکان. وەك دەبینین ئەو خاڵە نادیارەش لە خودی سوقراتدا دەبینرێت، بەلام ناکرێ لە بەر ئەوەی بەرەو پێشخستن‌و بەرەوپێش بردنی مرۆڤ هەولێدەدا لۆمە بکرێت چونکە ئاراستەیەکی گەورەی لە بەردەمدا بوو. هەموومان لە بەردەم هەڵەداین تەنانەت ئەگەر فەیلەسوفێکی گەورە بین. ئەو مەسەلەیە شایانی باسە ئەمەیە کە زۆرجار چاوەڕوانی ئەوە نین هەڵەکانمان بۆ ماوەی دوو هەزار ساڵ درێژەیان هەبێت.

**هەندێ وتار کە لە سوقراتیان گێڕاوەتەوە یان وتوویانە تایبەت بەوە:**

هەرچەند سوقرات هیچ نووسینێکی نەنووسیوە، بەڵام ئەم بەشە کە گێڕانەوەیەکە لە قسەکانی بۆ دەسپێکی شرۆڤەی فەلسەفەکەی:
کاتێك شتێك نازانم کەی لە توانامدا هەیە بنووسم.

***پاشان شرۆڤە دەکات:***

خواوەندێکی میسری هەبوو ناوی (تیۆس) بوو- ژمارەکانو هەندەسەو ئەستێرەناسیو نووسینی داهێنا. ڕۆژێکیان تیۆس بۆ لای (سامۆس) پاشای میسری گەورە چوو تا داهێنانەکانی پێ پیشان بدات. کاتێك تیۆس گەیشتە ئەوەی شرۆڤەی پیتەکان بکات وتی ئەمە داهێنانێکە بیر و مێشکی نەتەوەکەت زۆر دەگەشێنێتەوە. پاشا لە وەڵامدا وتی ئەی تیۆسی بیرمەند ئەلفوبێیەکەت بە پێچەوانەوە کاریگەری دەبێت. لەمڕووەوە کاتێك میسرییەکان لەگەڵ ئەوەی پشت بە نووسین دەبەستن ئیتر لە زەینو مێشکیان کەڵك وەرناگرنو لە بری ئەوەی لە هێزی ناخیان کەڵك وەربگرن بۆ ناساندنی شتەکان بەم داهێنانە کەڵك لە هێما دەرەکیەکان وەردەگرن کە شتەکان بە بیری خۆیان بهێننەوە.

**نامەکانی فایدۆن- ئەفلاتوون**

سوقرات پاش ئاماژەدان بە پیشەکەی دایکی کە مامان بوو شێوازە فەلسەفیەکەی خۆی بە شوبهاندن بە پیشکەی دایکی راڤە دەکات:
شێوازی یارمەتیدانم بۆ زاوزێ کردن کە من بە کاری دێنم هاوشێوەی ئەوەیە کە مامان- کان بە کاری دێنن بەم جیاوازییە ئەوان لە سەر ژنان کار دەکەن‌و من لە سەر پیاوان. ئەوانە لە سەر جەستە کار دەکەن‌و من لە سەر زەین‌و بیروڕا. من بێبەشم لە ژیری‌و بیرمەندی، بۆیە (ئاپولۆن) منی بۆ کاری بیرکردنەوە راسپاردووەو منی لە کارەکانی تر بێبەش کردووە.

**نامەکانی تایتۆس - ئەفلاتوون**

***هەندێ قسە کە گێراویانەتەوە:***

ئەو ژیانەی تاقی کراوەتەوە بایەخی ئەوەی نیە بۆی بژیت.

**نامەکانی ئاپولۆژین - ئەفلاتوون**

ئاگاتۆن- ی بەڕێز ئەمە راستیەکە کە ناتوانی ئەوە بە هیچ دابنێت، رەدکردنی سوقرات کارێکی ئاسانە.

**نامەکانی میوانی - ئەفلاتوون**

رۆژێك کەسێکی نامۆ کە پسپۆڕ بوو لە روخسارناسی دا سەیری ئەسیناییەکانی دەکرد. کاتێك سەیری سوقراتی کرد بە راشکاوی وتی ئەوە کەسێکی بلیمەتە کە لە ناخی دا ئارەزووی ئاژاوەیی جۆراوجۆری تێدایە. سوقرات تەنها بەم رستەیە وەڵامی دایەوە: تۆ بە باشی دەمناسی کاکی بەڕێز.

**مەسەلەی سوقرات لە (ئەمانی بتەکان) — نیچە**

کەسێك سەبارەت بە هاوسەرگیری لەگەڵ سوقراتدا راوێژی کرد. سوقرات وای پێوت:" هەر کارێکت پێخۆشە ئەنجامی بدە چونکە بێ ئەوەی بزانی چیت کردووە پەشیمان دەبیتەوە."

**ژیانی فەیلەسوفە گەورەکان - دیۆژین لارتیۆس**

ئەریستیپۆس لە سوقراتی پرسی ئایا شتێکی باش شك دەبەیت. سوقرات وتی: "زۆر شت" ئەوسا ئەریستیپۆس پرسی:" ئایا ئەوانە هەموویان هاوشێوەی یەکترن؟". سوقرات وەڵامی دایەوە:" هەندێ لەوانە لە رادەبەدەر لە بنەڕەتدا پێکەوە جیاوازن." پاشان

ئەریستیپۆس پرسی:" کەواتە ئەی چۆنە کە شتێکی جوان هەرگیز هاوشێوەی شتێکی تری جوان نیە؟". سوقرات وەڵامی دایەوە:" ئەو پیاوەی کە بۆ زۆرانبازی بە شێوەیەکی جوان نەگەری هەیە لەگەڵ کەسێکی تردا کە بۆ راکردن پەروەردە بووە جیاوازە. هەروەها ئەو قەڵغانەی کە بە مەبەستی بەرگری بە جوانی دارێژراوە بە تیرێکی کەوان کە بە جوانی بۆ پێکانی مەبەست دارێژراوە جیاوازە."

## ممۆرابیلیای سوقرات – گزنفۆن

لە کاتی دادگایی کردندا سوقرات سەبارەت بەوەی خۆشەویست نیە قسەی کاهینی (پیاوی ئاینی) پەرستشگەی دلفی بە بیری ئەوانەی لە دەوریدا بوون، هێنایەوە کە لە لایەن ئاپولۆنەوە وتراوە و سوقراتی بە بیرمەندترین پیاو دانابوو، بەمجۆرە دەدوێت:
کاتێك ئەم قسەیەم بیست لە بەر خۆمەوە وتم مەبەستی خوا دەبێ چی بێت؟ چونکە من بە باشی ئاگادارم لەوەی بێبەشم لە زانایی. لە لایەکی تر ئەوەش دەزانم کە خوا درۆ ناکات. پاش ماوەیەك بیرکردنەوە لەمبارەوە بڕیارم دا تا راستیەکانی قسەی خواوەند تاقی بکەمەوە. ئەگەر بمتوانیبا تەنانەت پیاوێك بدۆزمەوە کە لە من زاناتر بێت بۆ بەتاڵ کردنەوەی ئەو قسەیە سەرکەوتووم. ئەوسا رۆیشتووم بە دوای ئەو کەسەدا بگەڕێم کە لە زاناییدا ناوبانگی لە من زیاتر بوو. پێویست ناکات ناوی بێنم. پیاوێکی سیاسی بوو ئنجا دەرەنجامی

قسەکانمان ئەمە بوو. کاتێك لەگەڵ ئەوەدا قسەم کردبوو دەرکەوت لە راستیدا کەسێکی زاناو بیرمەند نیە هەرچەند کەسانێك هەبوون ئەویان بەو تایبەتمەندییە دەناسی تەنانەت خۆی زیاتر لە خەڵك بڕوای بەو بۆچوونانەی خەڵك هەبوو ئەوەشی بە ماف خۆی دادەنا پێی بڵێن زاناو بیرمەند. پاشان هەوڵمدا بۆی شرۆڤە بکەم کە بڕواکانی سەبارەت بە بیرمەندبوونی تەنها خەیاڵە. لە ئاکامدا ئەو و ئەو کەسانەی لە نێوانماندا شایەتحاڵ بوون رقیان لێ هەڵگرتم. لە کاتی ماڵئاواییم لەگەڵیدا بە خۆمم وت: زۆر چاکە، هەرچەند بە بۆچوونی من هیچ یەك لە ئێمە دوانە ئەو بابەتەمان بە بابەتێکی بەپێز نەدەزانی، بەڵام من لە سەرووی ئەو بووم چونکە ئەو شتێکی نەدەزانی، بەڵام خۆی بە زانا دادەنا، بەڵام من نە شتێك دەزانم نەش دەڵێم زانام. وادیارە من لەم روانگەوە لە سەرووی ئەو بم، پاشان بەرەو لای کەسێکی تر رۆیشتم کە زیاتر لەوەی یەکەم پروپاگەندەی زانایی‌و بیرمەندی هەبوو و ئەنجام وەرگرتنم وەك کەسی یەکەم وابوو. بەوشێوەیە بوو کە دوژمنێکی نوێم بۆ خۆم دروست کرد.

**نامەکانی ئاپولۆژیا — ئەفلاتوون**

***سوقرات لە بەردەبەیانی مردنی دا لە ناو ژووری تاکەکەسیی دا کە لەگەڵ هاوڕێکانی سەبارەت بە راستی‌و نەمری قسەی دەکرد:***

وادیارە تەنگەیەکی باریکە کە لە رێگای ژیریەوە رێنماییمان دەکات ئەم سەفەرە کۆتایی پێبێت. مادام کە گرێدراوی جەستەین‌و ئەم دۆخە ناحەقە تێکەڵ بە وزەمان بووە هەرگیز ناتوانین ئەو شتەی

ئارەزووومان لێیەتی واتە راستیەکان بە دەستی بێنین. لەمڕووەوە کە جەستە هەموو کاتەکانمان بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی خۆی تەرخان دەکات. کاتێك جەستە نەخۆشە ناهێڵێت بە دوای راستیەکاندا بڕۆین، لەو کاتانەش کە تەندروستیمان باشە بوونمان لە شەهوەتو ئارەزووو و ترس و خەیاڵو دەمارگیریمان پڕ دەکاتەوە. جەستە ڕێگرە لە بەردەم بیرکردنەوەی باش. جەستەو ویستەکانی دەبنە هۆی شەڕ و کێشەی کۆمەڵایەتیو رقو کین. لەو روانگەوە کە سەرچاوەی شەڕەکان ئارەزووە بۆ دەوڵەمەندبوونو کۆکردنەوەی دارایی، لە بەر ئەوەش ئێمە ئەخسیرو کۆیلەی دەستی جەستەین ناچارین بە دوای داراییدا بڕۆین. بۆیە هیچ دەرفەتێك نادۆزینەوە بۆ بەدواداچوونی فەلسەفە. تەنانەت ئەگەر بتوانین بۆ ماوەیەك خۆمان لە بەندی جەستە رزگار بکەینو بیر لە مەسەلەیەك بکەینەوە دیسانەوە ئەوە لە هەر پلەو توێژینەوەیەکدا دەبێتە هۆی زەحمەتو سەرلێشێواویو شڵەژاندنی یادگەمان، بۆیە ناتوانین راستیەکان بە دەست بێنین. ئەگەر بە باشی بیری لێبکەینەوە دەبینین کە پێداویستی گەیشتن بە زانستی رەسەن بە واتای رزگاربوونە لە چوارچێوەی جەستە. تەنها وزەیە دەتوانێ راستیەکان بەو جۆرەی کە هەن ببینێت. تەنها پاش مردنە کە دەتوانین ئەو زانایییەی ئارەزوومان دەکرد بە دەستی بێنین کە بە دوایەوە بووین بە دەستی بێنین، بەڵام پێش مردن ئەم کارە لە سەر چەند هۆکارێك کە وتمان ئەگەری بە دەستهێنانی لە ئارادا نیە.

ئەگەر قبوڵ بکەین تا کاتێك لە بەندی جەستەداین‌و بڕوامان وابێت بەدەستهێنانی زانایی ڕەسەن ئەگەری جێبەجێ کردنی نیە یەك لەو دوو لەتە دەبێ ڕاست بێت، یان هەرگیز زانایی ڕاستەقینە بە دەست ناهێنین یان پاش مردن بەوە دەگەین. چونکە پاش مردنە کە وزە سەربەخۆ و جیا لە جەستە دەمێنێتەوە. لە کاتی زیندوو بووندا تەنها کاتێك دەتوانین زانستی ڕاستەقینە بە دەست بێنین کە کارمان بە سەر جەستەوە نەبێت جیا لەو شتانەی کە بە تەواوی پێویستمان پێیەتی‌و لەو ناراستەیەشدا جەستە تووشی ئەو پۆخڵەواتانە نەهاتبێت. دەبێ دوور لە کێشە جەستەییەکان بژین تا ئەو کاتەی ڕزگارمان دەبێت. کاتێك بگەینە ئاستی ڕزگاری تەواوی جەستە، دەتوانین وا بیر بکەینەوە ئەو کەسانەی گەیشتوونەتە ڕزگاری‌و پاکی‌و بوونەتە هاوڕا، ئەوسا بگەینە زاناییەکی ڕەسەن.

**نامەکانی فایدۆن — ئەفلاتوون**

ئێستا کاتی جیابوونەوەمیە. من بەرەو مردن دەڕۆم‌و ئێوەش بەرەو ژیان کە درێژەی پێدەدەن. کامەیان ڕێگایەکی باشترە ئەوە کەس ئاگای لێ نیە.

**نامەکانی ئاپۆلۆژیا — ئەفلاتوون**

## بەرواری ڕووداوە گرنگە فەلسەفیەکان

| ڕووداو | ساڵ |
| --- | --- |
| دەسپێکی فەلسەفەی ڕۆژئاوایی لەگەڵ بیرکردنەوەکانی "تالیس مەلتی". | سەدەی شەشەمی پ.ز |
| مردنی فیساغورس. | کۆتایی سەدە (سەدەی شەشەمی پ.ز): |
| سوقرات لە ئەسینا تاوانبارە بە مردن. | ٣٩٩ پ.ز: |
| ئەفلاتوون ئەکادیمیای خۆی کە بە یەکەمین زانکۆ دەژمێردرێت لە ئەسینا دایمەزراند. | ٣٨٧ پ.ز |
| ئەمپەراتۆر کنستانتین، ئەمپەراتۆریای ڕۆما بەرەو شاریبیزانسدەگوازێتەوە | ٣٢٤ ز |
| سنت ئاگۆستین کتێبی دان پیادانانەکانی خۆی دەنووسێت | ٤٠٠ ز |
| ڕووخانی ئەمپەراتۆریای ڕۆما بە دەستی (ڤیزیگتەکان)و سەردەمی دەسپێکی زوڵم. | ٤١٠ ز |
| پشۆی ئەکادیمیای ئەسینا بە فەرمانی ئەمپەراتۆریای پوستینین هێمای کۆتایی سەردەمی | ٥٢٩ ز |

| | |
|---|---|
| | زانستی یۆنانە |
| ناوەڕاستی سەدە | تۆماس ئاکۆیناس شرۆڤەی خۆی بۆ ئەرەستوو دەنووسێت. |
| سەدەی سێنزەهەم | سەردەمی فەلسەفەی وانە وتنەوە. |
| ١٤٥٣ ز | رووخانی بیزانس بە دەستی تورکەکان، کۆتایی سەردەمی ئەمپەراتۆریای بیزانس. |
| ١٤٩٢ ز | کریستوف کولۆمب دەگاتە ئەمریکا |
| ١٥٤٣ ز | کۆپەرنیك کتێبی "سەبارەت بە سوڕانەوەی گۆ ئاسمانیەکان" بڵاودەکاتەوەو لە بواری بیرکاریەوە سەلماندی کە زەوی بە دەور خۆردا دەگەڕێت. |
| ١٦٣٣ ز | کەنیسە گالیلەی ناچار کرد بە فەرمی حاشا لە بیرۆکەی ناوەندگەرایی خۆر بکات. |
| ١٦٤١ ز | دکارت، "بیرکردنەوەکان"ی خۆی چاپ دەکات. دەسپێکی سەردەمی فەلسەفەی مۆدێرن. |
| ١٦٧٧ ز | کتێبی "ئەخلاق"ی ئەسپینۆزا پاش مردنی چاپو بڵاو دەبێتەوە. |

| | |
|---|---|
| ١٦٨٧ ز | نیوتون کتێبی "بنەما" بڵاو دەکاتەوەو تیایدا باسی چەمکی راکێشان دەکات. |
| ١٦٨٩ ز | لاك، " نامیلکەی سەبارەت بە تێگەیشتنی مرۆڤ" بڵاو دەکاتەوەو بنەمای ئەزموون بەرەو سنورێکی نوێ دەبات. |
| ١٧١٦ ز | مردنی لایبنیتس. |
| ١٧٣٩ -٤٠ ز | هیوم، "نامەیەك لەبارەی سروشتی مرۆڤ" بڵاو کردەوەو بنەمای ئەزموونی تا سنورە مەنتقیەکەی بەرەو پێش دەبات. |
| ١٧٨١ ز | کانت بە یارمەتی هیوم لە "خەوی ئیرادەی خۆی هەستاوە"و کتێبی "رەخنە لە بیری رەسەن"ی بڵاو کردەوە. |
| سەردەمی شکۆداری متافیزیای ئەڵمانیا دەستی پێکرد. | هیگڵ، کتێبی "دیاردەناسی زەین"ی بڵاو کردەوە کە ئەوپەڕی لوتکەی متافیزیای ئەڵمانیایە. |
| ١٨١٨ ز | شۆپێنهاوێر، کتێبی "جیهان بە واتای ئیرادەو پەرچدانەوە"ی بڵاو کردەوەو |

| | |
|---|---|
| | فەلسەفەی هیندووستان لە متافیزیای ئەڵمانی خستەڕوو. |
| ١٨٨٩ ز | نیچە بە راگەیاندنی ئەم بابەتە لە شاری (تورینۆ) کە "خوا مردووە" تووشی تێکچوونی دەروونی دەبێت. |
| ١٩٢١ ز | وینگنیشتاین، "نامیلکەی مەنتقیو فەلسەفی" خۆی بڵاو دەکاتەوەو پێداگرە لە سەر دوایین بە دەسهێنانی رێگاکانی مەسەلەی فەلسەفە. |
| دەیەی ١٩٢٠ ز | ئەڵقەی ڤییەنا، پوزیتیڤیزمی مەنتقی بڵاو دەکاتەوە. |
| ١٩٢٧ ز | هایدگەر کتێبی "هەبوون و کات" چاپ دەکات کە باسی جیایی لە نێوانفەلسەفەی شیکاریو فەلسەفەی ئەوروپایی پێشۆ دەکات. |
| ١٩٤٣ ز | سارتەر بە بڵاوکردنەوەی کتێبی "هەبوونو نەبوون" بیرۆکەکانی هایدگەر تەواودەکاتو فەلسەفەی ئەگزیستانسیالیزم دەخاتەڕوو. |
| ١٩٥٣ ز | بڵاوکردنەوەی کتێبی "لێکۆڵینەو فەلسەفیەکان"ی وینگنیشتاین" پاش مردنی خۆی ئەوپەڕی سەردەمی شیکردنەوەی زمانە. |

## ڕۆژژمێری ژیانی سوقرات

| ساڵ | ڕووداو |
|---|---|
| ٤٢٩ پ.ز | لە نزیك ئەسینا لە دایك دەبێت. |
| پێش ٤٤٠ی پ.ز | پێشگۆی پەرستشگەی دلفی سوقرات بە بیرمەندترین پیاو دادەنێت. |
| نزیکەی ٤٣٠پ. | سەربازی کردنی سوقرات لە شەڕی پلوپۆنزی‌و ڕزگاربوونی لەو شەڕەدا بە دەستی ئالکیبیادیس. |
| ٤٢٣ پ.ز | ئەریستۆفان لە کومێدێك دا سووکایەتی بە سوقرات دەکات. |
| نزیك ٤٢٠ پ.ز | هاوسەرگیری لەگەڵ گزانتیپ و پاش یەك دەیە سێ منداڵیان دەبێت. |
| ٤٠٦- ٤٠٥ پ.ز | بوون بە ئەندام لە لیژنەی یاسادانان. |
| ٤٠٤ پ.ز | جێبەجێ نەکردنی فەرمانی "سی جەبار" بۆ دەست بە سەر کردنی "لیۆن". |
| ٣٩٩ پ.ز | تاوان خستنە پاڵی بێ باوەڕی‌و گەندەڵکردنی گەنجەکان، دادگایی کردنی سوقرات‌و سزادانی مردن. خواردنەوەی ژەهر و مردن. |

## ڕۆژژمێری سەردەمی سوقرات:

| ساڵ | ڕووداو |
|---|---|
| دەیەی ٤٦٠ی پ.ز | ئیسخیلۆس یەکەم درام نووسی تراژیدیای کلاسیك لە لوتکەی دەسەڵات. |
| ٤٦٠ی پ.ز | ڕوودانی یەکەم شەڕی نێوان پلوپۆنزی واتە لە نێوان ئەسیناو ئەسپارت. لەدایکبوونی بوقرات دانەری پزیشکی کلاسیك لە دوورگەی خیۆس |
| ٣٤٠ی پ.ز | کۆتایی یەکەم شەڕی پلوپۆنزی. |
| ناوەڕاستی دەیەی ٤٤٠ی ز | دەسپێکی سەردەمی ئاڵتۆنی ئەسینا لە کاتی پریکلیس، لەم سەردەمەدا ڕۆشنبیری ئەسینا گەیشتە لوتکە. |
| ٧٤٤ی پ.ز | دەسپێکی بینای پەرستشگەی پارتنۆن لە ئەکرۆپۆلیسی ئەسینا. |
| ٤٤٠- ٤٤١ پ.ز | شەڕی دووهەمی پولوپۆنزی لە نێوان ئەسپارتو ئەسینادا. |
| ٤٢٩ی پ.ز | مردنی پریکلیس. |
| ٤٢٨ی ز | مردنی ئانکساگۆراس یەکەم فەیلەسوفی ئەسینایی، مامۆستای سوقراتو پریکلیس. |

| | |
|---|---|
| | |
| ٤١٥ی ز | بردنی سوپای گەورەی ئەسینا بۆ گرتنی سیسیل تووشی شکست دەبێت. |
| ٤٠٣ی ز | چەك كردنی "سی جەبار" و گەڕانەوەی دیموکراسی. |
| ٤٠٠ی ز | چاکسازی یاساو لێبوردنی گشتی (کە ساڵی دواتر سوقراتی نەگرتەوە). |

## زنجیرە کتێبی ناسینی فەیلەسوفەکان


- نیچە
- سوقرات ✓
- ئەرستۆ
- ئەفلاتوون
- ئیسپینۆزا
- ئاکویناس
- ئاگوستین قەدیس
- دیکارت
- سارتەر
- کیرکگور
- ئەنیشتاین
- هیگڵ
- هیوم
- ماکیافیلی
- لایبنیتس
- لاک


## زنجیرەی ناسینی فەیلەسوفەکان

ناسینی فەیلەسوفەکان زنجیرەیەکە لە ژیانی فەیلەسوفە بەناوبانگەکانو دەرگایەکی کراوەیە بۆ ناسینی بیروڕاو ڕوانگەکانیان. لە هەر کتێبێك لەم زنجیرەیەدا جیا لە خستەڕووی زانیاری سەبارەت بە ژیانی فەیلەسوفەکان، بیرو بۆچوونی هەر فەیلەسوفێك لە پەیوەندی لەگەڵ فەلسەفەدا دەوترێتەوەو هاو ئاراستەیە لەگەڵ ڕووداو و گۆڕانکارییە هزریو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیرییەکانی سەردەمی خۆیاندا. گرنگترین بیری فەیلەسوفەکان بە زمانێکی سادەو ڕوون باس کراوە لە هەمان کاتیشدا لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوی مێژوویی فەلسەفی وەرگیراوەو وردبینیەکی باشی لە سەر بووە. تازەپێگەیشتوانو گەنجانو هەموو خوێنەران کە فەلسەفەیان بەلاوە چێژبەخشە ئەم کتێبانە دەتوانێ هاوڕێو یارمەتیدەرێکی باش بێت بۆ جۆری بیرکردنەوەکانی. ڕەنگە ببێتە دەسپێکێك بۆ ئاڵوگۆڕ لە ژیاندا.

سایە